# کوێزەبانە

## (حەوتم)

## لە سوننەتی صەحیحی پێغەمبەری خودا ﷺ

ئامادەکردنی

عبدالوالي عبدالرحيم علي قزلجي

چاپی سێیەم

چاپێکی زیادکراوو بژاردەکراو

١٤٣٣ ك ٢٠١٢ ز

# گوێزەبانە

## (حەوتم)

# لە سوننەتی صەحیحی پێغەمبەری خودا(ﷺ)

ئامادەکردنی

عبدالوالي عبدالرحيم علي القزلجي

زیادکراو وە بژاردەکراو

چاپی سێ یەم

١٤٣٣ کۆچی ٢٠١٢زاینی

**ناوی نامیلکە : گوێزەبانە لە سوونەتی صەحیحی پێغەمبەردا (ﷺ).**

**ناوی ئامادەکار :** عبدالوالي عبدالرحيم علي قزلجی.

**ژمارەی سپاردن : ( ٣٤٦ ).**

**نۆرەی چاپ : سێیەم.**

**ساڵی چاپ : ١٤٣٣ ك ـ ٢٠١٢ ز.**

**تیراژ: ١٠٠٠ دانە.**

**چاپ خانە:**

**بنکەی بڵاوکردنەوە : ( کتێبخانەی سیما ــ چەمچەماڵ )_( کتێبخانەی سوننە _ سلێمانی )_( کتێبخانەی ئیمان_سلێمانی )_( کتێبخانەی زانست _ کەلار )_( کتێبخانەی پێشین_هەولێر ).**



# پێشەکی چاپی یەکەم

إِنَّ الحَمْـدَ للهِ نَحْمَـدُهُ وَنَـسْتَعِيْنُهُ وَنَـسْتَغْفِرُهُ وَنَعُـوْذُ بِـاللهِ مِـن شُـرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ.

وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ.

وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ [سورة آل عمران ١٠٢].

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾[سورة النساء : ١].

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾[سورة الأحزاب : ٧٠ - ٧١].

أَمَّا بَعْدُ:

فإن خير الحديث كتاب الله، وأحسن الهدي هدي محمد (ﷺ)، و شر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەستاوە بە چاودێری کردنی مرۆڤەکان هەر لەسەرەتای هاتنە ناو دونیاوە و پاشان قۆناغی گەنجی و ووردە وردە چونە ناو تەمەنی پیری و لە کۆتایشدا مردنی، چونکە وەك ئاشکرایە دروست بوونی مرۆڤ و پاشان ژیان و مردنی بەبێ هۆ نیە و هەروا بەخۆڕای نیە، بەڵکو مەبەست لە هاتنە بوونی هۆیەکی ڕوون و ئاشکرایە، ئەویش بریتی یە لە پەرستنی خوای گەورە بەوشێوەیەی کە وویستی لەسەرە، لەژێر ڕۆشنای ناردنەخوارەوەی پەیام و هەڵبژاردنی پێغەمبەران (عليهم من الله أفضل الصلاة وأتم السلام)، مرۆڤیش لە هەموو ئاستەکانی ژیانیدا پێویستی بە هەندێك یاسا و حوکم و ئاڕاستەکردن هەیە هەتا بتوانێت لەو ڕێیەوە ڕێگای ڕاست و دروست بگرێتە بەر و خوای گەورە لە خۆی ڕازی بکات .

ئەم کتێبەش کە لە بەردەستت دایە، باسی قۆناغێکی کاتی دەکات لە ماوەی ژیانی مرۆڤدا، کە ئەویش ساتی هاتنە ناو دونیایەتی‌هەتا حەوتەم ڕۆژی لەدایك بوونی.

کەواتە پێویستە موسوڵمان هەستێت بە جێ‌بەجێ کردنی ئەو مافەی کەحەقێکی منداڵەکەیەتی بەسەریەوە لەو چەند ڕۆژەی سەرەتای ژیانی کە شەرع بۆی دیاری کردووە.

ئەویش بریتی یە لە ئەنجامدانی گوێزەبانە و کۆمەڵێ کاری تر کە لە ناوەڕۆکی کتێبەکەدا ڕوون کراوەتەوە، بە پشت بەستن بە صەحیحی سوونئەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، هەروەها بۆچونی ڕاستی زانایانی پێشین، ئەوەندەی کە خوای گەورە توانای داوە.

خوێنەری خۆشەویست: بەهۆی نەبوونی نووسراوێکی ڕێك و پێك و تاڕادەیەك نزیك لە سوونئەتەوە دەربارەی گوێزەبانە بەزوبانی پاراوی کوردی، وە وەکو ئەرکێکی سەرشانی خۆم بەخزمەت کردنی‌شەرعی خوا و ڕوون کردنەوەی، هەستام بە نووسینی‌ئەم‌چەندپەڕەیە، وەکو

ئامۆژگـــاری و بیرخـــستنەوەیەك بـــۆ خـــۆم وســـەرجەم موسوڵمانانی کوردستان.

داواکارم لە خوای گەورە کە بیکاتە مایەی خێـر و چـاکە بۆ نووسەرەکەی وەبۆ ئەو کەسانەی کە بـڵاوی دەکەنـەوە، وە بۆ ئەو کەسانەی دەیخوێننەوە و هەڵدەسن بە جێ بەجێ کردنی ناوەڕۆکەکەی، وە هەرچیەك کە تێیدا بـوو لـە حـەق ئەوا لە خوای گەورەوەیـە و فـەضـلی خۆیـەتی، وە هەرچـی یەکی تێدا بوو لە بەتاڵ و ناحـەقی ئـەوا لـە خۆمەوەیـە و لـە شەیتانی بەد کارەوەیە.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد و على آله وصحبه أجمعين.

كتبه: عبدالوالى عبدالرحيم علي القزلجي.

# بەشی یەکەم:
# ئەو کارانەی کە لە پێش لەدایك بون و کاتی لە دایك بوونی منداڵدا هەیە

- فەرمان کردنی شەرع بە موسوڵمانان بۆ زۆر خستنەوەی وەچە و منداڵ.
- نهێنی یەکەم قیژە و گریانی ساوای لە دایك بوو .
- مژەدە دان بەو کەسەی چاوەڕێی منداڵ دەکات.
- ئەو پیرۆزبای یەی کە لە تازە بووك دەکرێت وە پێی دەڵێن (بە دایکی کوڕ بیت) پیشە و کاری سەردەمی نەفامی و پێش هاتنی ئاینی ئیسلامە .

**فەرمان کردنی شەرع بە موسوڵمانان بۆ زۆر خستنەوەی وەچە و منداڵ**

ئاینی پیرۆزی ئیسلام هانی موسوڵمانان دەدات بەوەی کە هەوڵی ئەرێ بدەن وەچە و نەوەی زۆر و باش بخەنەوە، بۆ ئەوەی ئوممەتی ئیسلام هەمیشە لە بەرەو پێش چوون و دەسەلآت و هێزدا بێت، هەتا دوژمنانی ئیسلام ترس و بیمی موسوڵمانان لەناودڵ و دەروونیاندا بۆ ساتێکیش جیا نەبێتەوە.

لەوانەیە بوترێ زۆری موسوڵمانان چ دەورێکی هەیە ئەگەر توانای ماددی و لۆجستیان کەم بێت؟!، لە وەلآمی ئەم پرسیارەدا دەڵێین: ئەگەر موسوڵمانان لە ڕووی ژمارەوە زۆر بوون و بیروباوەڕیان پتەوبوو بە خوای خۆیان ئەوا بێ گومان کاریگەرییەکی گرنگی دەبێت لەسەر داهاتووی موسوڵمانان، هەربۆیە پێویستە گوێ نەگرین لەو بیرو بۆچونە هەڵەیەی کە داوا دەکات ڕێژەی منداڵ بوون کەم بکرێتەوە، بە بانگەشەی ئەوەی کە پەروەردە و فێرکردنیان کارێکی گرنگە و هەروا ئاسان نی یە.

نــەخێر هــەرگیز لەگــەڵ ئــەو بۆچــونەدا نــین وەکــو موسوڵمان، وە پێشمان وایە کە ئاینی ئیسلام هەستاوە بـە چارەسەرکردنی پەروەردەکردنی منداڵ بەتایبەتی و مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی، وە کۆمەڵێك ئاداب و ئاکاری بـۆ دانـاوە، هەر لە هاتنە ناو دونیاوەی هەتا کۆتا پلەکانی ژیانی.

بەڵکو لەسـەرمان پێویـستە کـە هەسـتین بـە جـێبـەجێ کردنــی ئــەو فەرمانــەی پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) کــە هــانی موسوڵمانان دەدات بەوەی کە نەوەی زۆر بخەنەوە.

وە لەچەندەها فەرموودەدا ئاماژەی پێ کـردووە لەوانـە: ((تَزوَّجوا الوَدودَ الوَلود فإني مُكاثِر بِكُم الأمَمْ ))[1].

واتە: با ئەو ئافرەتەی دەچنە داخوازی کەسێکی خاوەن ڕێز وخۆشەویست بێت، وەلە هەمان کاتدا توانای منداڵ بوونی هەبێت، وە من دڵ خۆشم بە زۆریتان لە چاو ئومەتەکانی تردا لە ڕۆژی دوایدا.

---

[1] صحيح: أخرجه أبوداود (٢٠٥١) وقال شيخنا الألباني: حسن صحيح برقم (٢٠٥٠) في صحيح سنن أبي داود، والنسائي( ٦\٦٥-٦٦ )، والحاكم(٢\١٦٢)، وابن حبان( ١٠٥٩ )، وصححه الحاكم، و وافقه الذهبي .

لەوانەیە بوترێ ئێمە چۆن بزانین کە ئەو ئافرەتە منداڵی زۆری دەبێت؟ دەڵێین: بڕوانە دایکی و پوری و خزمانی نزیکی.

وە خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ فَٱلۡـَٰٔنَ بَٰشِرُوهُنَّ وَٱبۡتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ ﴾البقرة: ١٨٧.

واتــە: لەمــەو دوا بۆتــان هەیــە بــچنە لای خێزانــەکانتان، کەمەبەست پێی شەوانی ڕەمەزانە، وە بەو نیازە بچنە لایـان کە خودای گەورە ئەوەی کە نوسیویەتی لە چارەتان پێتانی ببەخشێ، کە لەسەر بۆچونی هەندێك لە زانایان وەك (مجاهد و الحکـم و عکرمـة و الحـسن البـصري و الـسدي و الـضحاك) بریتیە لە منداڵ، وە دایکمـان عائـشە (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەفــەرموێت: پێغەمبــەری خــودا (ﷺ) دەفــەرموێت: ((**ژن هێنان سوننەتی منە، وە هەرکەسێك کردەوە بە سوننەتی من نەکات، ئەوە لە من نیـە، ژن بهێـنن، مـن شـانازی بـە**

زۆریتانەوە دەکەم لە بەرامبەر ئوممەتەکانی تردا لە ڕۆژی دوایدا))[٢].

## نهێنی یەکەم قیژە و گریانی ساوای لە دایک بوو

ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لیبێت بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرمویەتی: ((**صياح المولود حين يقع {وفي رواية يولد} نزغة من الشيطان**))[٣].

واتە : ئەو قیژەیەی کە منداڵ دەیکات لەکاتی لەدایک بونیدا بە هۆی ئەو تێوەژەنینەی شەیتانەوەیە لەو کاتەدا کە لەدایک دەبێت، شەیتان ئامادەیە و ئەکێشێت بە هەردوو کەلەکەیدا و ئازاری پێ دەگات، هەر بۆیە منداڵەکەش دەست دەکات بە گریان، تەنها عیسا نەبێت (سەلامی خوای

---

[2] صحيح لغيره: أخرجه ابن ماجه(١/٥٩٢/١٨٤٦) من طريق عيسى بن ميمون عن القاسم عن عائشة قالت: قال رسول الله (ﷺ): (فذكره)، وقد جاء مفرقا في الحديث، وقد جمعها وخرجها شيخنا العلامة الألباني_رحمه الله_ في الصحيحة (٢٣٨٣).

[3] أخرجه البخاري ( ٣٢٤٨ )، و مسلم ( ١٥\١٢٨_ نووي)، والطبراني في الصغير( ٢٩ )، والرواية الأخرى له، وإبن حبان ( ٦١٥٠-٦٢٠١-٦٢٠٢ ).

لەسەربێت))، چونکە شەیتان کاتێك ویستی لێی بدات لە پشتەوە لێیانداو نەیتوانی ئازار بە عیسا(سەلامی خودای لەسەربێت) بگەیەنێت.

جا باشە هێشتا ئەم منداڵە هیچ نازانێت ئەم دوژمنە سەرسەختەی ئاوای لێ دەکات،وە ئەوەندە ڕقی لێیەتی، ئەی باشە کە ووردە ووردە گەورە بووە چووە تەمەنەوە دەبێت چی لێ بکات!؟، پەنا بەخوا لە شەڕی شەیتان.

وە هەردەربارەی گریانی منداڵ ئیبن قەیم ڕەحمەتی خودای لێبێت دەفەرموێت: ((وە گریانی منداڵ لە کاتی لەدایك بونیدا بەڵگەیە لەسەر لەش ساغی، و بەهێزی، وتوندو تۆڵی ئەو منداڵە))[٤].

## مژدەدان بەو کەسەی چاوەڕێی منداڵ دەکات

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی مژدە بەخشینی کردووە بەو کەسانەی کە منداڵیان پێبەخشراوە لە لایەن خوای گەورەوە لە چەندەها ئایەتدا، وە ئەو مژدەدانە دەبێت

[4] تحفة المودود بأحكام المولود، لاپەڕە:(٤٦٠).

بـەهـۆی دروسـت بـوونی سـۆز و خۆشەویـستی لـە نێـوان موسوڵمانان‌دا، خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ يَـٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَـٰمٍ ٱسْمُهُۥ يَحْيَىٰ ﴾ مريم: ٧، هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ فَبَشَّرْنَـٰهُ بِغُلَـٰمٍ حَلِيمٍ ﴾ الصافات: ١٠١.

خـوای گـەورە لـەم دوو ئایەتـەدا مـژدە دەدات بـە هـەردوو پێغەمبەرەکـەی(زەکـەریا و ئیـبراهیم) (سـەلامی خودایـان لەسەر بێت)، کەوا منداڵی پێ بەخشیون.

(وە لەبەر ئەوەی مژدە دان مرۆڤ دڵ خۆش دەکات و ئاسودەی دەکات، سوننەتە بۆ موسوڵمان کە هەستێت بە مژدە بەخشین و دڵ خۆش کردنی برای موسوڵمانی، وە خۆش حاڵی بکات بەو شتانەی کە پێی خۆشە،...خۆ ئەگەر پێش ئەو مژدەکەیان پێدا سونەتە پیرۆزبای لێبکات، وە جیاوازی مژدەدان و پیرۆزبای کردن ئەوەیە کە: مژدەدان ئاگادار کردنەوەیەتی لەو شتەی کە خۆشحاڵی دەکات، وە پیرۆزبای کردن دۆعا کردنە بۆ ئەو کەسە بەوەی کە خدیا

خێرو چاکەی توش بکات لەو شتەی کە پێشتر هەواڵیان داوەتیٚ)[5]، هەروەها دروستە و کارێکی جوانە کە ئەو کەسەی مژدەکەت دەداتیٚ شتێکی پیٚ ببەخشی[6]، هەروەك چۆن (کەعبی کوڕی مالیك) عەباکەی خۆی دا بەو کەسەی کە مژدەی لیٚ خۆش بوونی خوایی بۆ هێنا، وە پێویستە وەکو موسوڵمان حەز بە خۆشی و شادی موسوڵمانان بکەین و دلٚ تەنگ و ناڕەحەت ببین بە ناخۆشیان.

**ووتنی بە دایکی کوڕ بیت پیرۆزبای سەردەمی نەفامەکان بووە**

ئەم جۆرە پیرۆزبای کردنە کارێکی خراپە و پیشە و کاری سەردەمی نەفامیە، وە دروست نیە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی لیٚ کردووە، وەك (حەسەن) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((**أن عقيل بن أبي طالب تزوج إمرأة من جشم فدخل عليه القوم فقالوا: بالرفاء والبنين، فقال: لا تفعلوا ذلك ( فإن رسول الله نهى عن ذلك )، قالو: فما نقول يا أبا زيد؟**

---

[5] تحفة المودود بأحكام المولود للإمام ابن قيم الجوزية رحمه الله، ص:(٥٨_٥٩).

[6] أخرجه البخاري(٤٤١٨)، ومسلم(٢٧٦٩).

قال: قولو: بَارَكَ اللهُ لَكُم، و بَارَك عَلَيْكُم إنا كذلك كُنا نُؤمَرُ))[٧].

واتە:(عەقیلی کوڕی ئەبی طالیب)ژنێکی خواست لە قەومی (جشم)، کاتێك کە خزمەکانی هاتن بۆلای پێیان ووت: بە دڵی خۆش بێت و بە دایکی کوڕ بن، ئەویش ووتی: وا مەڵێن چونکە (پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەهی کردووە لە ووتنی ئەو قسەیە)، ئەوانیش ووتیان: ئەی بڵێین چی ئەی باوکی زەید؟ فەرمووی: بڵێن: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە هاوسەرگیریتانەوە، خوای گەورە بەرەکەتی خۆی برژێنێت بە سەرتاندا، ئێمە فەرمانمان پێ کراوە کە ئاوا بڵێین.

---

[7] رواه النسائي ( ٢\٩١)، و إبن ماجه ( ١\٥٨٩ )، و الدارمي (٢\١٣٤)، و البيهقي ( ٧\١٤٨ )، و احمد ( رقم : ٣٧٣٩\٤٥١ )، (( قال الإمام الألباني_رحمه الله_ في اداب الزفاف ص : ١٧٦- طبعة دارالسلام: (يتقوى بمجموع الطروق )).

## دوو پرسیاری گرنگ

**پرسیاری یەکەم:** ئایا دروستە سنووردارکردنی خستنەوەی منداڵ؟

**وەڵام:** ئەم سنووردارکردنە یەکێکە لەو بەڵایانەی کە موسوڵمانان پێوەی گیرۆدە بوون، لەگەڵ ئەوەی کە ئەم سنووردار کردنە چەندەها شێوەی هەیە، بۆ نموونە ئەگەر ئەودیاری کردنەی منداڵ بوونەلە ژمارەیەکی کەمدا بگەڕێتەوە بۆ ئامۆژگاری پزیشکە موسوڵمانە دڵسۆزەکان، وەکو ئەوەی کە ئامۆژگاریان بۆ ئەو ژن و مێردە ئەوە بێت کە سنووردارکردنی منداڵیان لەبەر خاتری تەندروستی ئافرەتەکەیە کە بەهۆیەوە زیانی پێدەگات، ئەگەر ئەم ئامۆژگاری یەلە لایەن پزیشکێکی زیرەکی موسوڵمانەوە بوو ئەو کاتە ئەمە عوزرێکی شەرعی یە بۆ ئەو ئافرەتە کە نەهێڵێت منداڵی ببێت، مادەم زیانی پێ دەگات، ئەم جۆرە لە نەهێشتنی منداڵ بوون لە دوای چەند دانەیەك دروستە، با نموونەیەکی تر باس بکەین کە پێچەوانەی نموونەکەی

پێشترە، ئەگەر هاتوو ژن و مێردێك حەزیان كرد ئیتر منداڵیان نەبێت یان منداڵیان زۆر نەبێت، بەهۆی ترسی هەژاری، بۆ نموونە دەڵێت من و ژنەكەم دووان، دوو منداڵیشمان هەیە ئەوە چوار، پێنجەمیشمان سەگەكەمانە...هەریەكێك لەم ئەندامانە چەندە ڕۆژانە سەرف دەكات و چەندی پێویستە (كە ئەمەش سیفەتی گاوور و جولەكەیە)، ئەو پارەیەی بەهۆی فەرمانبەرییەوە وەری دەگرین سەری مانگ هەر ئەوەندەیە كە بەشی ئەم پێنجەمان بكات، ئا ئەم بێنە و بەردەیە لە ئیسلامدا حەرامە و دروست نی یە، لە بەر ئەوەی پاڵنەر بۆ نەهێشتنی منداڵ بوون لێرەدا بریتی یە لەو بیركردنەوە نەفام و خراپەی پێش هاتنی ئاینی ئیسلام كە خوای گەورە موسوڵمانانی لێ ئاگادار دەكاتەوە و دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ﴾الإسراء: ٣١.

واتە منداڵەكانتان مەكوژن لەترسی هەژاری ئێمەڕزقی ئێوەو ئەوانیش دەدەین، هەروەها كەسی باوەڕدار و

موسوڵمان باوەڕی وایە کە ئەو منداڵە پێش ئەوەی بێتە ئـەم دونیایەوە هەر لەناو سکی دایکیدا ڕزقەکـەی دیـاری کـراوە، هەروەك لە فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەردا (ﷺ) هـاتوە، کەواتـە نەهێـشتنی بـوونی منـداڵ، یـان دیـاری کردنـی بـە ژمارەیەك دروسـت نـی یـە، و حەرامـە مەگـەر لـە بـەر هـۆی نموونەی یەکەم نەبێت[8].

**پرســـیاری دووەم:** ئایــا دروســتە بــەکارهێنانی حــەپی نەهێشتنی منداڵ بوون (حبوب المنع)؟

**وەڵام:** دروستنیە بەکارهێنانی ئەو جۆرە حەپانە، تـەنها لـە حاڵەتێکی زۆر پێویستدا نەبێت، ئەویش کاتێك کـە پزیـشکی شارەزا بڕیـار بـدات بـەوەی کـە سـك پڕبـوونی ئـەو ئافرەتـە دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە تەندروستی و مردنی دایکەکەی لێ دەکەوێتەوە، بەڵام بەکارهێنانی ئەو حەپە بۆ دواخستنی ماوەی سك پڕ بوون دروستە بـۆ ئافرەتێـك ئەگـەر پێویـستی پێ بێت، وەك ئەوەی کە تەندروستی و لاشەی توانای ئەوەی

[8](الحاوي من فتاوى الشيخ الألباني لاپەڕە: ٣٣٢ ).

نـەبێت کـە هـەموو سـاڵێك منـداڵی ببێـت، یـاخود بـە هـۆی شیردانی منداڵی بچوکی یـەوە نـەتوانیٚ، بـەو مەرجـەی ئـەو حەپـەی بەکاری دەهێنێت ڕیٚ لە سك پڕ بوون نەگرێت، بەڵکو تەنها ماوەی سك پڕبوونەکە دوا بخات، ئەمەش کاتێك دەبێت کە سەردانی پزیشکی شارەزا بکات و ئەو بڕیار بدات بـەوەی کە پێویستە ئەو حەپە بەکار بهێنێت[9].

[9] ( المنتقى من فتاوى فضيلة الشيخ صالح الفوزان (١٧٥\٣) ).

## بەشی دووەم:

## ئەو كارانەی كە لە یەكەم ڕۆژی لەدایك بوونی منداڵدا دەكرێت

- شیرین كردنی مەلآشووی.
- سوودی مەلآشوو شیرین كردن ( التحنيك ).
- بانگ دان بە گوێ ی منداڵە لەدایك بووەكەدا.

# شیرین کردنی مەلاشووی

(**تحنيك**): بریتی‌یە لەجووینی شتێك و پاشان شتە جوراوەکە بخرێتە ناو دەمی منداڵەکەوە، وە بسوێتەمەلاشووی.

وە لەڕوی زمانەوانیەوە: مجدالدين الفيرزو آبادي دەڵێت: (الحنكُ) محركة: باطنُ أعلى الفم من داخل، أو الأسفل من طرف مُقدّم اللّحيين، واتە: بەشی سەرەوەی ناو پۆشی دەم، یاخود بەشی خوارەوەی ئەم لاولای بەشی پێشەوەی هەردو لاچەنگ، و (حنك) (كحتنكه) والصبي: مضغ تمرا أو غيره فدلكه بحنكه، واتە: بۆمنداڵ: بریتیە لە جوینی خورما یان هەر شتێکی تر نەرم و تفتی بکات بە شەویلگەکانی[10].

بەڵگەش لەسەری:

---

[10] بڕوانە: معجم القاموس المحيط دانراوی: مجدالدين محمد بن يعقوب الفيروز آبادي، چاپی دار المعرفه لاپەڕە: ٣٢٠، ماددەی: (حنك)، هەروەها بڕوانە: معجم الصحاح للإمام إسماعيل بن حماد الجوهري، چاپی دار المعرفه، لاپەڕە: ٢٦٩، ماددەی (حنك).

١.فەرمودەکەی (أبي موسى الأشعري) (خودا لێی ڕازی بێت) دەفەرمویێت: **((ولد لي غلام، فأتيت به النبي فسمّاه إبراهيم، فحنكه بتمرة، و دعا له بالبركة، و دفعه إلي، و كان أكبر ولد أبي موسى ))**[11].

ئەبوموسای ئەشعەری دەفەرمووێت: ((کوڕێکمان بوو، منیش بردم بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش ناوی نا ئیبراهیم و مەلاشووی شیرین کرد بەخورمای جوراوی ناو دەمی خۆی و دۆعای خێر و بەرەکەتی بۆ کرد، پاشان دایەوە دەستم، وە ئەو منداڵە کوڕە گەورەی (ئەبو موسا) بوو)).

دەبینین لە دوای لەدایك بوونی ئەو منداڵە باوکی هەر زوو هێنای بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)، وە لە دوای ناونانی مەلاشووی شیرینکرد بە خورما.

کەواتە ئەگەر کەسێك نەیتوانی گوێزەبانە بکات یان نەیویست بیکات پێویست ناکات ناونانەکەی دوابخات بۆ ڕۆژی حەوتەمی، هەروەها شیرین کردنی مەلاشووی منداڵ

---

[11] رواه البخاري(٥٤٦٧)، ومسلم(٢١٤٥).

مەرج نیە حەوتەم ڕۆژ بێت، بەڵکو دروستە و سووننەتە سوا بەدوای لەدایك بوونی مەلاشووی شیرین بکرێت.

٢.عن أسماء بنت أبي بلك(رضي اللهِ عنها) أنها حملت بعبدالله بن الزبير بمكة، قالت: ((فخرجت و أنا متم، فأتيت المدينة فنزلت قباء، فولدت بقباء، **ثم أتيت رسول الله(ﷺ) فوضعته في حجره ثم دعا بتمرة فمضغها ثم تفل في فيه فكان أول شئ دخل جوفه ريق رسول الله (ﷺ)، ثم حنكه بتمرة ثم دعا له فبّرك عليه))**[12]

ئەسمائی کچی ئەبوبەکر (خوا لێیان ڕازی بێت) سك پڕ بوو بە(عبدالله)وە، وە باسی بەسەرهاتی خۆی دەکات و دەفەرمووێت: لە مەککەوە کۆچمان کرد بۆ مەدینە، وە سکم نۆ مانگ بوو، کاتێك کە گەیشتینە مەدینە لە ( قوباء ) لاماندا و لەوێ منداڵەکەم بوو، پاشان بردم بۆلای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش خستی یە کۆشیەوە و داوای خورمای

[12] أخرجه البخاري(٥٤٦٩)، ومسلم(٢١٤٦)، والترمذي(٣٨٢٦)، وأحمد(٦\٢٤٧)

کرد، ئنجا خورماکەی خستە ناو دەمیەوە و جووی، پاشان هەندێکی خستە ناو دەمی منداڵەکەمەوە، وە ئەوە یەکەم شت بوو کە چووە ناو گەدەیەوە، هەر بە خورکامە مەلأشووی شیرین کرد و دۆعای خێری بۆ کرد و دەستی هێنا بە لاشەی دا)).

٣. قالت عائشة رضي الله عنها: ((أتي النبي بصبي يحنكه فبال عليه، فأتبعه الماء ))[١٣].

واتە: منداڵێکیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەوەی ناو دەمی شیرین بکات، منداڵەکە میزی کرد بە کۆشیدا و پێغەمبەریش(ﷺ) ئاوی کرد بە شوێنی میزەکەدا.

٤.فەرمودەکەی ئەنەسەی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) دەربارەی گەلحە (ڕەزای خودای لێبێت) تێیدا هاتوە: ((فقال لي أبو طلحة: احمله حتى تأتي به النبي(ﷺ)، وبعثت به بتمرات، فأخذه النبي(ﷺ)، فقال: ((أمعه شيء؟)) قالوا:

---

[13] ( فتح الباري – ٥٤٦٨).

نعم تمرات، فأخذها النبي(ﷺ)، فمضغها، ثم أخذها من فيه، فجعلها في فيِّ الصبي، ثم حنكه، وسماه: عبدالله))[١٤].

واتە: ئەبوتەلحە پێی وتم: ئەم منداڵە هەڵبگرە هەتا دەیبەتە لای پێغەمبەر(ﷺ)، وە چەند دەنکە خورمایەکی وشکیشم لەگەڵیدا نارد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) منداڵەکەی لێ وەرگرتم و فەرموی: ((هیچی لەگەڵدا هاتوە؟)) وتیان: بەڵێ چەند دەنکە خورمایەکی وشک، ئەویش خورماکەی وەرگرت و جووی، پاشان هێنایە دەر لەناو دەمیدا، وە خستیە ناو دەمی منداڵەکەوە، پاشان مەلاشو ناودەمی پێ شیرین کرد، وە ناوی نا: عبدالله.

ئەم فەرمودانەی کە باسمان کرد بەسە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو کارە، کە بریتیە لە شیرین کردنی مەلاشووی منداڵ، وە بزانین کە سوونەتە و پێویستە پێی هەستین.

---

[14] أخرجه البخاري(٥٤٧٠)، ومسلم(٢١٤٤).

**ئیمامی نەوەوەی** دەفەرمووێت: ((ئەمفەرموودانە چەند سوودێکی لێ وەردەگیرێ، لەوانە سوننەتە مەلاشووی منداڵ شیرین بکرێت بەتێکڕای زانایان، هەروەها کەسێکی خاوەن بیروباوەڕ پاك و کردار و ووتە جوان هەستێت بەو کارە ئیتر پیاو بێت یان ئافرەت، هەروەها سوننەت وایە کە مەلاشووی بە خورما شیرین بکرێت بەڵام ئەگەر بە غەیری خورماش مەلاشوویان شیرین کرد هەر دەبێت، هەرچەندە خورما چاکترە،...هەروەها ڕازی بوون بەو ناوەی ئەو کەسەی کە مەلاشووی شیرین دەکات))[15].

## سوودی مەلاشو شیرین کردن( الحكمة من التحنيك )

زانایان قسەوباسێکی زۆریان کردووە دەربارەی حیکمەت لە مەلاشوو شیرین کردن، وە باسی زۆرێك لەو بۆچونە جیاوازانەیان کردووە دەربارەی ئەو مەسەلەیە لەگەڵ ئەوەی کە هیچ کام لەو بۆچونانە پاڵپشتێکی نیە لە شەرعدا.

---

15 (شرح صحيح مسلم لنووى_ ٣٧٢\١٤ ).

ئیمـام (العـینی) لـە((عمـدة القـاریٔ))دا دەفـەرمووێت:

((ئەگەر بڵێیت سوودی مەلاشوو شیرین کردن چی یە؟ ئـەوا دەڵێم: هەندێك لـە زانایـان دەفـەرموون بـۆ ئەوەیـە کـە ئـەو منداڵـە ڕابێـت و پـەراوە بێـت بـۆی هــەتا بتوانێـت نـان بخوات،(سبحان الله) لەم بۆچونە سـارد و سڕە، کـەی ئەمـە ڕاستە لە کاتێکا کە مەلاشوو شیرین کردن دوا بەدوای لەدایك بوونیەتی و نان خواردن زیاتر لە دوای دووەم ساڵی دەست پێ دەکات، یان کەمتر یاخود زیاتر، بـەڵکو حیکمـەت تێیـدا گەشبین بوونە بەوەی کـە ئـەو منداڵـە بـاوەڕدار بێـت لەبـەر ئـەوەی خورمـا بەرهـەمیئـەو درەختەیـە کـەپێغەمبـەری خو(ﷺ) شوبهاندوویەتی بە ئیماندارەوە ...)[16].

## بانگ دان بە گوێ ی منداڵە لەدایك بووەکەدا

هەموو ئەوانەی کە باسی ئەم مەسەلەیان کردووە یـاخود شتیان نووسیوە زۆربەیان دەڵێن بانگ دان بە گوێ ی منداڵدا سـوننەتە، بـەلام لـە ڕاسـتیدا وانیـە، چـونکە هـەموو ئـەو

---

[16] عمدة القارئ بشرح صحيح البخاري ( ٢١\٨٤).

فەرموودانـەی دەربـارەی بـانگ دان هـاتووە هـەر هـەمووی لاوازە، وە لە کتێبی(أحکام المولود)دا کە نووسراوی هەردوو قوتابی عیلم (سالم علی راشد الشبلی) و(محمـد خلیفـة محمـد الرباح)ە لە لاپـەڕە(٣٤-٣٩)دا بـە شـێوەیەکی تێـر و تەسـەل باسی ئەو فەرموودانە کراوە و لێکۆڵینەوەیەکی باشی لەسەر کراوە، منیش لەبەر گرنگـی باسـەکە بـە پێویـستم زانـی کـە بۆتی نقلّ بکەم هەرچەندە دوور و درێژە:

دەربـارەی بـانگ دان بـە گـوێی منداڵـدا سـێ فـەرموودە هاتووە:

یەکەم: عن أبي رافع مولى رسول الله (ﷺ) قال: **((رأيت رسول الله (ﷺ) أذن في أذن الحسن بن علي باصلاة حين ولدتهفاطمة رضي الله عنها)).**

**واتە: پێغەمبەری خودام بینی (ﷺ)، بانگی دا بەگوێی حەسەنی کوڕی عەلیدا هەروەکو بـانگی نوێـژ، کاتێـک کـە فاطمە بوی (ڕەزای خوایان لێبێت).**

أخرجه أبوداود(٥١٠٥)، و الترمذي(٤\١٥١٤)، و البيهقي في ((الكبرى))(٩\٣٠٠)، والشعب(٦\٣٨٩-٣٩٠)، والطبراني في ((الكبير))(٩٣١-٢٥٧٨)، والدعاء له(٢\٩٤٤)، وأحمد(٦\٩-٣٩١-٣٩٢)، وعبدالرزاق(٧٩٨٦)، والطيالسي(٩٧٠)، والحاكم (٣\١٧٩)، والبغوي في ((شرح السنة))(١١\٢٧٣). وقال الحاكم: صحيح الإسناد ولم يخرجاه. و تعقبه الذهبي فقال: قلت ((عاصم ضعيف)). وقال الترمذي: هذا حديث حسن صحيح، كلهم من طريق سفيان الثوري عن عاصم بن عبيدالله عن عبيدالله بن أبي رافع عن أبيه به.

وأخرجه الطبراني في ((الكبير))(٩٢٦,٢٥٧٩)، و أورده الهيثمي في ((مجمع الزوائد))(٤\٦٠) من طريق حمّاد بن شعيب عن عاصم بن عبيدالله عن علي بن الحسين عن أبي رافع بزيادة: (( **أذن في أذن الحسن و الحسين**، و قال في آخره: (( **و أمرهم بذلك**)).

ففي هذا لإسناد حمّاد بن شعيب، ضعفه ابن معين، وقال البخاري: منكر الحديث، وفي موضع آخر: تركوا حديثه، وقال الهيثمي في المجمع: (٤\٦٠) فيه حماد بن شعيب وهو ضعيف جدا. قلنا: وفيه أيضا عاصم بن عبيدالله وهو ضعيف وقد خالف حمّاد هذا سفيان الثوري سندا و متنا، حيث رواه عن عاصم عن علي بن الحسين عن أبي رافع بإبدال

عبيدالله بن أبي رافع بعلي بن الحسين و زاد لفظة (الحسين) و الأمر بالأذان، وحمّاد هذا ممن لا يقبل حديثه إذا انفرد لما علمت من ضعفه كيف وقد خالف من هو أوثق منه و أضبط وهو الثوري، فعلى هذا يكون حديث حمّاد منكرا، لضعفه أولا و لمخالفته الثقة ثانيا، أما الطريق الأولى وهي طريق سفيان ففيها عاصم بن عبيدالله. قال ابن حجر في التقريب: ((ضعيف)) و ذكر في ((التهذيب))(٥\٤٢) أن شعبه قال: ((كان عاصم لو قيل له من بنى مسجد البصرة لقال: فلان عن فلان عن النبي (ﷺ) أنه بناه)). قال الذهبي في ((الميزان))(٢\٣٥٤): قال أبوزرعة و أبوحاتم: منكر الحديث و قال الدارقطني : يترك، وهو مغفل، ثم ساق له حديث ابي رافع أن رسول الله(ﷺ) أذن في أذن الحسن و الحسين)) أنتهى.

فالحديث على هذا ضعيف لأن مداره على عاصم و قد عرفت حاله، وقد ذكر ابن القيم في كتابه تحفة المودود(١٧) حديث أبي رافع ثم أورد حديثين أحدهما عن ابن عباس و الآخر عن الحسين بن علي و جعلهما شاهدين لحديث أبي رافع و بوّب على هذا بابا سمّاه استحباب الأذان في أذن الصبي، و ليس هذا بجيد منه لما ستعلم قريبا انشاءالله تعالى.

أما حديث ابن عباس _ دووەم _ فأخرجه البيهقي في شعب الإيمان (٨٦٢٠\٦) عن محمد بن يونس عن الحسن بن عمرو بن سيف السدوسي نا القاسم بن مطيب عن منضور بن صفيه عن أبي معبد عن ابن عباس: (( **أن النبي أذن في أذن الحسن بن علي يوم ولد فأذن في أذنه اليمنى و أقام في أذنه اليسرى** )) واته: پێغەمبەر(ﷺ) بانگی دا بە گوێی حەسەنی کوڕی عەلیدا (ڕەزای خوایان لێبێت) ئەو ڕۆژەی کە لەدایك بو، بانگی دا بە گوێی ڕاستیدا وە قامەتی دا بە گوێی چەپیدا. ثم قال البيهقي في إسناده ضعف.

قلنا: هو موضوع وعلته الحسن بن عمرو هذا قال في ((التقريب)) ((متروك ))، وقال ابن أبي حاتم في ((الجرح و التعديل))(٢٦\٢\١) ترجمة رقم (١٠٩): ((سمعت أبي يقول رأيناه بالبصرة ولم نكتب عنه وهو متروك الحديث)). وقال الذهبي في الميزان: ((كذبه ابن المديني، و قال البخاري كذاب و قال الرازي متروك )).

وكما هو معلوم من قواعد مصطلح الحديث: أن الحديث الضعيف لا يرتقي إلى الصحة أو الحسن، إلا بمجينه من طريق أخرى، بشرط الاّ يكون في هذا الطريق من يشتدّ ضعفه فضلا عن أن يكون فيه كذاب أو متروك، فالحديث و الحالة هذه يبقى على ضعفه ولا يرتقي إلى رتبة الإحتجاج به، فالذي تقتضيه الصناعة الحديثية أن حديث ابن عباس

لايصلح أن يكون شاهدا لحديث أبي رافع فيبقى على ضعفه و يكون حديث ابن عباس موضوعا.

وأما حديث الحسين بن علي _ سیٚ یەم _ فهو من رواية يحيى بن العلاء عن مروان بن سالم عن طلحة بن عبيدالله عن الحسين بن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): (( **من ولد له مولود فأذن في أذنه اليمنى و أقام في أذنه اليسرى لم تضرّه أم الصبيان**)).

واتە: هەرکەسێك منداڵێکیان بو وە بانگیدا بە گوێی ڕاستیدا، وە قامەتیدا بە گوێی چەپیدا، ئەوا جنۆکە ناتوانن زیانی پێ بگەیەنن.

أخرجه البيهقي في ((شعب الإيمان))(٦\٣٩٠)، وابن السني في ((عمل اليوم و الليل))(ح – ٦٢٣)، و أورده الهيثمي في ((مجمع الزوائد))(٤\٥٩) وقال: رواه أبو يعلى و فيه مروان بن سالم الغفاري وهو متروك. قلنا وهو عنده برقم (٦٧٨٠).

وقال محققه: إسناده تالف و يحيى بن العلاء متهم بالوضع ثم قال: ((كما يشهد له{أي لحديث أبي رافع} حديث عبدالله بن عباس ذكره ابن القيم في تحفة المودود(ص ١٦)، وأخرجه البيهقي في الشعب و به يتقوى حديث أبي رافع و لعله لذلك قال الترمذي: هذا حديث حسن صحيح أي لغيره والله أعلم أ.ه (١٢\١٥١-١٥٢).

قلنا: وليس الأمر كما قال فحديث ابن عباس فيه كذاب ولا يصلح أن يكون شاهدا لحديث أبي رافع كما تقدم البيان والله أعلم.

وحديث الحسين بن علي هذا ( موضوع ) و فيه يحيى بن علاء و مروان بن سالم يضعان الحديث كما ذكر هذا الشيخ الألباني_رحمه الله_ في ((سلسلة الضعيفة))(٣٢١)، و أورد حديث ابن عباس في الضعيفة تحت رقم(٦١٢١) و هذا هو الذي يقتضيه البحث العلمي الصحيح و يبقى حديث أبي رافع على ضعفه لأنه كما قال الحافظ ابن حجر في التلخيص (٤\١٩٤): ((و مداره على عاصم بن عبيدالله وهو ضعيف)). وقد أورد الإمام الألباني رحمه الله حديث أبي رافع في صحيح سنن الترمذي تحت رقم(١٢٢٤)، و صحيح سنن أبي داود(٤٢٥٨)، و قال حديث حسن. و قال في الإرواء (٤\٤٠١): هذا حديث حسن إن شاءالله.

وقال الشيخ الألباني_رحمه الله_ في ((سلسلة الضعيفة))(١\٤٩٣) مضعفا هذا الحديث: (( قد روى الترمذي بسند ضعيف عن أبي رافع قال: **رأيت رسول الله (ﷺ) اذن في أذن الحسين بن علي حين ولدته فاطمة بالصلاة**)).

وقال الترمذي: حديث صحيح ((والعمل عليه)) ا.ه، ثم قال الشيخ الألباني_رحمه الله_: (( يمكن تقوية حديث أبي رافع بحديث ابن عباس {ثم ذكره} أخرجه البيهقي في الشعب.

قلت_أي الشيخ الألباني_رحمه الله: (( فلعل إسناد هذا خير من إسناد حديث الحسن (والصواب الحسين) بحيث يصلح أن يكون شاهدا لحديث أبي رافع والله أعلم. فإن كان كذلك فهو شاهد للتأذين فإنه الذي ورد في حديث أبي رافع وأما الإقامة فهي غريبة والله أعلم)).

ثم قال الشيخ الألباني_رحمه الله_ في ((الإرواء))(٤\٤٠١): قلت وقد روى الحديث عن ابن عباس أيضا بسند ضعيف أوردته كشاهد لهذا الحديث عند الكلام على الحديث الآتي بعده في ((سلسلة الأحاديث الضعيفة)) رقم (٣٢١) و رجوت هناك أن يكون شاهدا لهذا والله أعلم.

ثم قال الشيخ_رحمه الله_ في الضعيفة: (طبع مكتبة المعارف) (١\٤٩٤) رقم: (٣٢١) ((و أقول الآن وقد طبع الشعب إنه لا يصلح شاهدا لأن فيه كذابا و متروكا فعجبت من البيهقي ثم من ابن القيم (وكذلك شيخه ابن تيمية) كيف اقتصرا على تضعيفه، حتى كدت أن اجزم بصلاحيته للإستشهاد فرأيت من الواجب التنبيه على ذلك و تخريجه فيما يأتي (٦١٢١) ))أ.ه.

## بەشی سێ یەم:

## ئەو کارانەی کە پێویستە ڕۆژی حەوتەم جێ بەجێ بکرێت

- گوێزەبانە( النسيكة أو العقيقة ).
- تاشینی سەری منداڵی لەدایك بوو.
- ناونانی.
- خەتەنەکردنی.

## گوێزەبانە (النسيكة أو العقيقة)

### ووشەی گوێزەبانە لە چی یەوە هاتووە؟

(**العَقيقة**) بەو شێوەی کەفەتحەیەك لەسەر پیتی (ع)دایە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاژەڵەی کە سەردەبڕێت بۆ منداڵی تازە لەدایك بوو.

لەگەڵ ئەوەی کەجیاوازی هەیەدەربارەی بنچینە و بنەمای ئەم ووشەیە، (أبوعبيد و الأصمعي) ووتویانە: ئەصلی ئەو ووشەیە بریتیە لەو قژەی کە لەسەری منداڵی تازە لەدایك بوودا ڕوواوە کاتیێ کە لەناو سکی دایکیدا بووە، وە (زەمەخشەری)یش و کەسانی تر لەئەهلیعیلم ئەم بۆچونەیان بەلاوە پەسەندە.

هەروەها هەندێکی تر دەڵێن: ناوی (حەوتم) بەو ئاژەڵە دەڵێن کە سەردەبڕێت بۆ ئەو منداڵە لەوکاتەدا، لەبەر ئەوەی لە کاتی سەربڕینەکەدا قژی دەتاشرێ.

وە ئیمام ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت: ((ئەم ووشەیە وەرگیراوەلە دوولەت کردن و بڕین، (ابن

عبدالبر) و کۆمەڵێك هەمان بۆچوونیان هەیە، خطابي دەفەرمووێت: (گوێزەبانە) ناوی ئەو ئاژەڵەیە کە سەردەبڕێت لەپای ئەو منداڵەی کە تازە لەدایك بووە، وە بۆیە دەوترێت: (عقیقة) لەبەر ئەوەی شوێنیدیاری کراولەملی ئەو ئاژەڵە لێدەکرێتەوە ودەبڕێت.

(ابن فارس) دەفەرمووێت: ((ئەو حەیوانەی کە سەردەبڕێت و قژی ئەو ساوایەی کە دەتاشرێتبە هەردووکیان دەوترێت(گوێزەبانە))، هەندێکیتردەڵێن: گوێزەبانە بەو شوێنە دەوترێت کە ووڵاخەکەی تێدا سەردەبڕێت.

**حافظ ابن حجر** دەفەرمووێت: ((دەربارەی ئەوەی کە بەو ئاژەڵە دەڵێن گوێزەبانە (عطاء) لە (ئیبن عەبباسە)وە بە مەرفوعی هێناویەتی: ((بۆ کوڕ دوو گوێزەبانە، بۆ کچ یەك گوێزەبانە))[17].

---

[17] أخرجه البزار، وقال لا نعلم بهذا اللفظ إلا بهذا الإسناد أ. ه. وقد ذكره لبيهقي في السنن الكبرى (٩\٣٠١) و وقع في عدة أحاديث:(( **عن الغلام شاتان و**

هـەروەها (العـق) لـە زمانـەوانی دا: بـە مانـای بـڕین و پـچڕاندن(قطـع) دێـت، هـەروەك دەوترێـت دەربـارەی ئـەو کەسەی کە پەیوەندی دەبڕێت لەگەڵ دایك و باوکی دا (العاق لوالیدیه) (أي قطع صلتهما).

وە (الجـوهري) دەفـەرموێت: (عـق عـن ولـده یعـق عقـا): دەوترێـت گوێزەبانـەی بـۆ منداڵـەی کـرد کاتێـك ئـاژەڵ سەردەبڕێت لە حەوتەم ڕۆژدا.

وە ئـەم نـاوەش واتـە (گوێزەبانـە) هـەموو سـەربڕینێك ناگرێتەوە، تەنها ئەوە نەبێت کە لە دوای لەدایك بوونی ساوا سـەردەبڕێت، وە ئەمـە بۆچـونی زانـای کـۆچ کـردوو (شـیخ محمدُ بن صالح العثیمین )ە ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

کەواتە (گوێزەبانە) لە شەرعدا: بەو ئاژەڵە دەوترێت کـە بۆ ساوای لەدایك بوو سەردەبڕێت وەکو سوپاس و ستایـشێك

---

عن الجارية شاة). ( فتح الباري، ص:٧٢٦ ج٩)، وقال شيخنا الألباني_رحمه الله في ((الإرواء))(٣٩٢/٤) وأخرجه الطبراني(٤٥٨/١) بسند جيد في الشواهد.

بۆ خوای گەورە بەمەبەست و نیازی عیبادەت و مەرجی تایبەت[١٨].

## واجبێتی گوێزەبانە (وجوب العقيقه)

گوێزەبانە زۆربەی زۆری زانایان فەتوایان‌داوە بەوەی کە حوکمی ئەو کارە هاتوە و جێگیر بووە لە شەرعدا و دروستێتی ئەو کارە هیچ گومانێکی تێدا نیە، لەوانە (ئیبن عەبباس و ئیبن عومەر و عائیشە و شارەزایانی‌تابعین و پێشەوا و زانایانی شاران (ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لێ بێت)، وە کۆمەڵێك فەرموودە لەو بارەیەوە هاتووە لەوانە:

١.قال عليه الصلاة و السلام: ((**مع الغلام عقيقته، فأهريقوا عنه دما و أميطوا عنه الأذى**))[١٩].

---

[18] بڕوانە: العين لا: ٦٢، قاموس المحيط لا: ٦١٦ مادة (عقت)، المنجد في اللغة لا:٥١٧ مادة (عق)، فتح الباري جزء: ٩،لا:٧٢٦).

[19] صحيح: أخرجه البخاري( ٥٤٧٢\٩ _ فتح )، و أبوداود(٢٨٣٩)، و الترمذي (١٥١٥)، و ابن ماجه(٢٨١\٢)، و النسائي(١٦٤\٧)، و الدارمي(٨١\٢)، و أحمد(١٨\٤_ ٢١٤_ ٢١٥) و غيرهم.

واتە: هەموومندالّێك كەلەدایك دەبێت گوێزەبانەی خۆی لە گەلّدایە، جا خوێنی بۆ بڕێژن (بە سەربڕینی حەیوان) وە ئازار و ناڕەحەتی لێ دوور بخەنەوە.

٢.هەروەها فەرموودەكەی (سەمورە) كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ((كل غلام رهين بعقيقته...الحديث))[20]. واتە : هەموو مندالّێك كە لەدایك دەبێت بارمتەیە هەتا ئەو گوێزەبانەی بۆ نەكرێت.

٣.وە فەرموودەكەی (السيدة عائشة) (رضي الله عنها) كە دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێ كردووین كەوا گوێزەبانە بكەین بۆ مندالّی كوڕ دوو شەك و بۆ مندالّی كچ شەكێك))[21].

---

[20] رواه أبوداود(٣\٢٨٣٨)، والترمذي(٤\١٠١\١٥٢٢)، والنسائي(٨\١٦٦\٤٢٢٠)، وابن ماجه(٢\١٠٥٦\٣١٦٥)، و أحمد(٥\٧_٨)، وصححه شيخنا الألباني_رحمه الله_ في ((الإرواء))(١١٦٥)، و في ((صحيح ابن ماجه))(٢٥٦٣).

[21] رواه الترمذي(٣\٣٥\١٥٤٩)، وابن ماجه(٢\١٠٥٦\٣١٦٣)، و صححه شيخنا في ((الإرواء))(١١٦٦)، و في ((صحيح ابن ماجه))(٢٥٦٢).

## بۆچوونی زانایان

ئیمـــامی شـــافعی دەفـــەرمووێت: دوو کـــەس لـــە بابـــەتی گوێزەبانەدا ڕۆچوون یەکێکیان دەڵێت: ئـەو کـارە بیدعەیـە، وە ئەوەی تریان دەلێت: واجبە.

ئەو کەسەی کە ئیمامی شافعی باسی دەکات بەوەی کـە دەڵێت واجبە مەبەستی پێی ئیمام (الليث بن سعد)ە، لەگـەڵ ئەوەی کە تەنها ئەم پێشەوا بەڕێزە وا نافـەرمووێت بەتـەنها بەڵکو (حسن و داود)یش دەفەرموون واجبە، وە ئەو کەسەی کە دەڵێت بیدعەیە، مەبەستی پێـی ئیمـام ئـەبو حەنیفەیـە، (ابن منذر) دەڵێـت: هـاوەڵانی ئـەبو حەنیفـە کـە بـە ئـەهلی ڕەئی ناسراوون ئینکاری ئەوە دەکەن کە گوێزەبانە سوننـەت بێت، بـەم بۆچونەشیان پێـچەوانەی ئـەو هـەموو فـەرموودە ڕاست و دروستەن کە باس کراوە.

وە بەڵگـــەی ئیمـــام ئـــەبو حەنیفـــە وهـــاوەڵانی ئـــەو فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە پرسیاری لێ کرا دەربارەی گوێزەبانە بە لەفزی(العقيقة) ئەویش فـەرمووی: ((لا يحب الله

**العقوق))** كأنه كره الإسم _ و قال: ((**من ولد له ولد فأحب أن ينسك عنه فلينسك، عن الغلام شاتان مكافئتان وعن الجارية شاة**))[٢٢].

واتە: خوای گەورە ئەو ناوەی پێ‌خۆش نیە (چونکە وەك ووتمان ووشەی (العقيقه) لە(عَقّ)ەوە هاتووە کە بە مانای ئازار و ناڕەحەتی دێت) ئنجا فەرمووی: ((هەر کەسێك لە ئێوە منداڵیان بوو وە وویستی حەیوانی بۆ سەرببڕێت ئەوا با بۆ منداڵی کوڕ دوو مەڕ کە لەیەکەوە نزیك بن وە بۆ منداڵی کچ یەك مەڕ.

بەڵام ئەم فەرموودەیە بە هیچ شێوەیەك نابێتە بەڵگە بۆیان و هیچ کاریگەری یەکی نیە لە گۆڕینی حوکمی گوێزەبانە.

---

22حسن: رواه مالك(٢١٨٣\٢)، و أبوداود(٢٨٤٢)، و النسائي(٧٥\٣_الكبرى)، و البيهقي(٣٠٠\٩)، و الحاكم(٢٣٨\٤)، و غيرهم و حسنه الإمام الألباني_رحمه الله_ في ((الإرواء))(٣٩٢/٤).

**حافظ ابن حجر** دەفەرموویێت: ((ئەم فەرموودەیە تەنها ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە باشتر وایە لە باتی ئەوەی بوترێ (عَقيقَة) بوترێ( نَسيكَة )، هەروەها (ابن أبی الدم) ڕیوایەتی کردووە لە هەندێك لە هاوەڵانەوە کە فەرموویانە باشتر وایە بوترێ(نسيكة) هەروەك چۆن باشتر وایە بوترێ (العشاء) لە جیاتی(عَتَمَة).

وە ئیبن قەیم_ڕەحمەتی خوای لێبێت_دەفەرموێت: ((وە ئەو وتەیەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێت:((عەقیقەم پێ خۆش نیە))، ئەوە تەنها ئاگادار کردنەوەیە لەسەر خراپی ئەو ناوانەی کە دڵ لێی ڕادەکات و پێی خۆش نیە، وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر دڵ تەنگ دەبو بەو شتانە، هەتا ئەوەی کە هەمو ناوێکی ناخۆشی دەگۆڕی بە خۆش، وە وازی دەهێنا لەو شوێنانەی کە ناوەکانیان ناخۆش بو وە تێیدا دانەدەنیشت، وە تێنەدەپەڕی بە نێوان دو شاخ کە

ناوەکانیـان نـاخۆش بوایـە، وە حـەزی بـە نـاوی خـۆش و تێڕوانینی باش بو))[٢٣] .

هـــەروەها (محمـــد بـــن حـــسن) دەڵێـــت: گوێزەبانـــە حوکمەکەی لە شەرعدا نەماوە و نەسخ بووەتەوە بە بەڵگەی فەرموودەی: ((**نسخ الأضحى كل ذبح**))[٢٤] .

واتە: قوربانی کردن هەموو سەربڕینەکانی تری لابردوو نەیهێشت، بەڵام ئەم فەرموودەیە لاوازە هەروەك (حافظ ابن حجر) دەفەرموێت[٢٥] .

هەروەها ئەبی رافیع بۆمان دەگێڕێتەوە کـە: ((**لما ولدت فاطمة حسنا قالت: يارسول الله ألا أعق عن إبني بدم؟ قال: لا**

---

[23] تحفة المودود لابن القيم_رحمه الله_ص:(٩٠).

[24] أخرجه الدارالقطني من حديث علي و في سنده ضعف.

[25] (فتح الباري،جزء ٩،لا : ٧٢٨ ).

**ولكن احلقي رأسه و تصدقي بزنة شعره فضة، ففعلت، فلما ولدت حسينا فعلت مثل ذلك ))**[٢٦].

واتە: ((کاتێك کە (فاطمة)_خوالێی ڕازی بێت_حەسەنی بوو، ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەتوانم گوێزەبانە بۆ ئەم کوڕەم بکەم و حەیوانی بۆ سەربېڕم؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام سەری بۆ بتاشە و بەقەد کێشی قژەکەی زیو بکڕە و بیدە بە هەژاراران، (فاطمة) دەفەرمووێت: منیش هەر بەو جۆرەم کرد، وە کاتێك کە حوسەینیشم بوو هەرهەمان شتم بۆکرد.

بەهەمان شێوە ئەم ڕووداوەش نابێتە بەڵگە بۆ ئەوانەی کە دەڵێن گوێزەبانە سوننەتە.

**حافظ ابن حجر** لە(فتح الباري،جزء ٩،لا : ٧٣٧)دا دەفەرمووێت: ((مامۆستاکەم لە شەرحی (سنن الترمذي)دا

---

[26] حسن: أخرجه ابن ابي شيبه(٨\٤٨)، و احمد(٦\٣٩٠-٣٩٢)، والبيهقي في ((الكبرى))(٩\٢٩٩)، والطبراني في ((الكبير))(٩١٧-٩١٨-٢٥٧٦-٢٥٧٧)، انظر الصحيحة(٣\٤٥٧) وقد حسنه الإمام الألباني رحمه الله.

دەفەرموویێت: تەفسیری ئەم فەرموودەیە بەوە دەکرێت کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوێزەبانەی بۆ حەسەن و حوسەین کردبێ وە پاشان (فاطمة)داوایئیزنیلێ کردووە بۆ ئەوەی خۆیشی گوێزەبانەیان بۆ بکات، هەربۆیە نەیهێشتووە، منیش دەڵێم (ابن حجر): لەوانەیە هۆی رێگری پێغەمبەر (ﷺ) لە(فاطمة) بۆ ئەنجامدانی گوێزەبانە بۆ کورەکەی بۆ ئەوە بگەرێتەوە کە ئیمامی عەلی ئەو کاتە هەژار بووبێت، هەر بۆیە رێنوومای کردوون بۆ جۆرێك لە خێر و صەدەقە کە لە حەیوان سەربرین ئاسان تر بووە، وە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی پاش ماوەیەك دەسەلاتی هەبووبێت و گوێزەبانەی بۆ کردبن.

هەروەها فەرموودەیەك هەیە کە: **((کان یؤتی بالصبیان فیبرك علیهم و یحنکهم ))**[27]

---

[27] رواه مسلم(٢١٤٧_ نووي )، وأبوداود(٥١٠٦)، وأبوعوانه(١\٢٠٢)، و احمد(٦\٢١٢)، والبغوي(١١\٢٧٢).

واتە: کاتێك کە منداڵیان لەدایك ببووایە دەیان هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش دۆعای خێری بۆ دەکردو مەلاشووی شیرین دەکرد.

بەهەمان شێوە ئەم فەرموودەیەش بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە گوێزەبانە سوننەتە، لەبەر ئەوەی ئەم فەرموودەیە بەڵگەی تێدا نیە کە ئەو منداڵانە گوێزەبانەیان بۆ نەکراوە، لەبەر ئەوەی باسی نەکردووە، وە قاعیدەیەکیش هەیە دەڵێت: ((نەبوونی زانیاری دەربارەی شتێك مانای ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو شتە نیە)). هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) واجب نیە لەسەری گوێزەبانە بۆ ئەو منداڵانە بکات بەڵکو واجبە کەس و کاری منداڵەکە بۆی بکەن، خۆ ئاشکرایە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەری هیچ منداڵێکی نەتاشیوە ئەکرێ بڵێین سەرتاشینی منداڵ دروست نیە یان نەهاتوە.

کەواتە ڕوون بوویەوە کە ئەنجامدانی گوێزەبانە واجبە و دەبێت کەس و کاری ئەو منداڵە پێی هەستن، ئەگەر توانایان هەبوو، وە پێشینەی ئەم ئوممەتە بەردەوام هەستاون بە

جێ بەجێ کردنی ئەم حوکمە شەرعیی یە و پەیوەست بوون پێوەی، ئەوەتا (یحیی الأنصاري) دەفەرموویت: ((گەشتم بە زۆرێك لە پێشین و ژیام لە ناویاندا، هەرگیز وازیان لە ئەنجامدانی گوێزەبانە نەدەهێنا و حەیوانیان بۆ منداڵی کوڕ و کچیان سەردەبڕی)).

وە (ابن منذر) دەفەرموێت: ((زانایان بۆچونیان جیاوازە دەربارەی واجبێتی گوێزەبانە، هەندێکیان دەفەرمون: گوێزەبانە واجبە، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێکردوە، وە فەرمانەکەشی واتە فەرزە.

وە حەسەنی بەصری_ڕەحمەتی خوای لێبێت_دەربارەی پیاوێك کە گوێزەبانەی بۆ نەکرابێت دەفەرموێت: ((خۆی بۆخۆی دەکات)).

وە (ابن الزناد) دەفەرموێت: ((گوێزەبانە کارێکە لە کارەکانی موسوڵمانان، ئەو موسوڵمانانەی کە پێیان ناخۆش بو کە وازی لێبهێنن)).

وە ئیمامی مالیک دەفەرموێت: ((هي سنة واجبة))، واتە: گوێزەبانە کاری پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و واجبە.

ئیبن قەیم_ڕەحمەتی خوای لێبێت_دەفەرموێت: ((سوننەتی واجب لەلای هاوەڵانی مالیک ئەوەیە کە پێی دەوترێ سوننەتی موئەکەدە، وە حەزیان بە وازلێهێنانی نەکردوە، هەربۆیە ناوی دەنێن واجب واتە سونەتە واجبەکان، هەربۆیە دەڵێن: خۆشۆردنی جومعە سوننەتێکی واجبە، وە قوربانی کردن سوننەتێکی واجبە، وە گوێزەبانە سوننەتێکی واجبە))[28].

وە دەربارەی ئیمام ئەحمەد_ڕەحمەتی خوای لێبێت_ لە بابەتی گوێزەبانەدا دو ڕیوایەتی لێوە کراوە لەسەر واجب بونی،هەروەك هاوەڵانی لێیانەوە گێڕاوەتەوە، بەڵام دەقێکی ڕون و ئاشکرا نیە لێوەی لەسەر واجب بونی.

---

[28] تحفة المودود لابن القيم، ص:(١٠١).

## ژمارەی ئەو حەیوانەی بۆ کوڕ و کچ سەردەبڕڕێت

ئــەوەی کــە لــە فەرموودەکانــدا هــاتووە بریتــی یــە لــە سەربڕینی دوو ئاژەڵ بۆ کوڕ وە یەك دانە بۆ کچ.

١.عن يوسف بن ماهك أنهم دخلوا على حفصة بنت عبدالرحمن فسألوها عن العقيقة؟ فأخبرتهم أن عائشة أخبرتها أن رسول الله(ﷺ) :((**أمرهم عن الغلام شاتان مكافئتان و عن الجارية شاة**))[29].

واتــە: پرســياريان کــرد لــە (حەفــصە)_خــوا لێــی ڕازی بێــت_دەربــارەی گوێزەبانــە؟ ئــەویش پێــی ڕاگەیانــدن کــە عائیشە_خوالێی ڕازی بێت_هەواڵی داوەتــێ کــە پێغەمبــەری خوا(ﷺ): ((فەرمانی پــێ کــردووین کــە بــۆ کــوڕ دوو مــەڕی هاوچەشن و بۆ کچیش یەك مەڕ سەرببڕن)).

---

[29] صحيح: أخرجه الترمذي(١٥١٣)، و ابن ماجه(٣١٦٣)، و البيهقي(٩\٣٠١) و غيرهم، وصححه شيخنا الألباني في ((الإرواء))(١١٦٦).

٢.عن أم الكرز قالت سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ((**عن الغلام شاتان و عن الجارية شاة لا يضركم ذكرانا كن أم إناثا**))[30].

واتە: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو(ﷺ) دەیفەرموو: ((بۆ منداڵی کوڕ دوو مەڕی هاوچەشن وە بۆ منداڵی کچ یەك مەڕ وە ئەو ئاژەڵەی کە سەری دەبڕن نێر بێت یاخود مێ بێت ئاسایيەو هیچی تێدا نیە)).

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت: ((**فأهريقوا عنه دما**)) لەم ڕیوایەتەدا بە شێوەیەکی نادیار دەفەرموێت خوێنێکی بۆ بڕێژن، بەڵام لە چەند فەرموودەیەکی تردا ئەو خوێن ڕشتنە دیاری کراوە و ڕوون کراوەتەوە، بەنمونەش ئەو فەرموودانەی کە پێشتر باسمان کرد.

---

[30] صحيح: اخرجه ابوداود(٢٨٣٤_٤٨٣٥)، و الترمذي(١٥١٦)، و النسائي في ((الكبرى))(٧٦\٣)، وابن ماجه(٣١٦٢)، والبيهقي(٩\٣٠٠_٣٠١)، وصححه شيخنا الالباني_رحمه الله_في ((الإرواء))(٤/٣٩٠_٣٩١)، و غيرهم .

هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ((**مع الغلام عقيقته**))، واتە: هەموو منداڵێك گوێزەبانەی خۆی لەگەڵدایە، هەردوو پێشەوا(حەسەن و قەتادە) تێگەیشتنیان بۆ ئەم ڕیوایەتە وەهایە کە تەنها منداڵی کوڕ گوێزەبانەی بۆ دەکرێت و گوێزەبانە بۆ منداڵی کچ ناکرێت، بەڵام بۆچونی تێکڕای زانایان پێچەوانەی ئەو بۆچونەیانە و دەفەرموون: گوێزەبانە بۆ کچیش دەکرێت، وە بەڵگەشیان ئەو هەموو فەرموودە ڕوون و ئاشکرایانەیە کە باسی گوێزەبانە دەکات بۆ کچ.

ئەبوهورەیرە بەمەرفوعیئەم فەرموودەیەمان بۆ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ): ((إن اليهود تعق عن الغلام كبشا ولا تعق عن الجارية فعقوا عن الغلام شاتان مكافئتان و عن الجارية شاة))[31].

[31] اخرجه البيهقي(٩\٣٠١_٣٠٢) عن أبي حفص سالم بن تميم عن أبيه عن عبدالرحمن الأعرج عن أبي هريرة مرفوعا وقال شيخنا الألباني_رحمه الله_ في ((الإرواء))(٤/٣٩٣) وسالم هذا وأبوه لم أر من ذكرهما، ثم قال: والحديث في

واتــە: جولەکــە گوێزەبانــە بــۆ منـداڵیان دەکــەن بــە سەربڕینی بەرانێك ئەگەر کوڕ بوو بەڵام گوێزەبانە بۆ کچ ناکــەن، ئــەمجا فــەرمووی: ئێــوەش (واتــە موســوڵمانان) گوێزەبانە بکەن بۆ کوڕ دوو بەرانی هاوچەشن وە بۆ کچ بەرانێك.

وە ئەم فەرموودانە بەڵگەن بۆ کۆدەنگی زانایان کە دەفەرموون دوو حەیوان بۆ کوڕ وە یەك حەیوان بۆ کچ.

دەبینین کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) زانی کە جولەکە تەنها حەوتم بۆ کوڕ دەکەن وە بۆ کچی ناکەن وەکو موخالەفەیەك بۆ جولەکە فەرمانی دا لەبری ئاژەڵێك بۆ کوڕ دوو ئاژەڵ سەرببڕن وە بۆ کچ حەیوانێك چونکەجولەکە حەیوانیان بۆ کچ سەرنەدەبڕی ئەمەش گرنگی و بایەخی ئاینی ئیسلام دەردەخات بەرامبەر بە ئافرەتان، کەچی کەسانی دڵ نەخۆش دەیانەوێت تانە و تەشەر لە ئاینی ئیسلام بدەن

---

((المجمع))(٤/٥٨) بنحوه، وقال: رواه البزار(١٢٣٣\٧٢\٢- كشف ) من رواية أبي حفص الشاعر عن أبيه، ولم أجد من ترجمهما.

بەوەی کە مافی ئافرەتانی پێشێل کردووە، بەڵام لە ڕاستیدا جولەکە و شوێن کەوتوانی جولەکە مافی ئافرەتانیان پێشێل کردووە و ئافرەتانیان کردووە بە یارییەك بە دەستی خۆیانەوە و دەیانەوێت بە نیازی پیس و گڵاویان بیان کەن بە میوەی سەرمێز و ئارەزو و شەهوەتیان بەوان پڕبکەنەوە.

بەڵام ئیمامی مالیك دەفەرمووێت بۆ هەردووکیان وەکو یەك، واتە هەریەکەیان حەیوانێك، وە بەڵگەشی ئەو فەرموودەیەیە کە دەڵێت: ((**أن النبي عق عن الحسن والحسين كبشا كبشا**))[32].

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ حەسەن و حوسێنی کچەزای، یەکی بەرانێکی بۆ سەربڕین، وە ئەمەش نابێتە بەڵگە چونکە لە ڕیوایەتێکی تردا کە (عکرمە) لە (ابن عباس)

---

32 صحيح: أخرجه أبوداود(٢٨٤١)، و ابن الجارود(٩١١,٩١٢)، و الطبراني في الكبير (٢٥٦٧ و ١١٨٥٦)، و الطحاوي في مشكل الاثار(١٠٣٩)، و غيرهم، وقال شيخنا الألباني_رحمه الله_ في ((الإرواء))(٣٧٩/٤) وهذا إسناد صحيح على شرط البخاري.

ڕیوایەتی کردووە دەفەرمووێت: ((**كبشين كبشين**))، واتە دووبەران[٣٣].

هەروەها چەند فەرمودەیەکی ترمان هەیە کە باسی ئەوە دەکەن کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دو ئاژەڵی بۆ هەریەکێکیان کردوە بە گوێزەبانە.

وە شێخ ئەلبانی_ڕەحمەتی خوای لێبێت_ دەفەرموێت: ((خوێنەری بەڕێز تێ بی نی ئەوە دەکات کە ڕیوایەتەکان جیاوازن دەربارەی ژمارەی ئەو ئاژەڵانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) کردونی بە گوێزەبانە بۆ حەسەن و حوسێن_ڕەزای خوایان لێبێت_لە هەندێکیاندا هاتوە کە یەك بەرانی کردوە بە گوێزەبانە بۆ هەریەکێکیان، وە لەڕیوایەتی تردا هاتوە کە دوو بەرانی کردوە بە گوێزەبانە، وە من وای

[33] اخرجه النسائي(٢/١٩٨)، والطبراني في ((الكبير))(٢/١٣٧/٣) دون الزيادة، وقال شيخنا الألباني_رحمه الله_ في ((الإرواء)) وإسنادهما صحيح، إسناد الأول على شرط البخاري.

دەبینم کە ئەمەی دوەم دەبێت وەربگرین و وە پشتی پێ ببەستین، ئەویش لەبەر دو هۆ:

یەکەم: ئەو ڕیوایەتانەی کە باسی دو ئاژەڵ دەکەن زیادەیەکی لەخۆ گرتوە بەسەر ئەو ڕیوایەتانەی پێشوتر، وە زیادەی کەسی متمانەدار قەبوڵە، بەتایبەت کە ئەو ڕیوایەتانە لە چەن ڕێگەیەکی جیاوازەوە هاتون.

دوەم: ڕیوایەتی دو ئاژەڵ هاوتایە لەگەڵ ئەو فەرمودانەی تر کە لەباسی گوێزەبانەدا هاتون وە بریتین لە قەولی پێغەمبەر خۆی(ﷺ)، کە پێویستی کردوە دو ئاژەڵ بۆ منداڵی کوڕ سەرببڕێت[٣٤].

کەواتە ئەگەر مرۆڤ نەیتوانی لە مەڕێك زیاتر بکڕێت یان دەستی نەکەوت، ئەوا هەر دروستەو گوێزەبانەی پێ دەکرێت، بەڵام ئەگەر کەسێك خوای گەورە ماڵ و سامانی دابوویە و توانای هەبوو ئەوا دوو حەیوانەکە چاکترە و

---

[34] ((إرواء الغليل)) لشيخنا الألباني_رحمه الله_(٤/٣٨٤).

باشترە و ئەوەش سوننەتە وە ئەمە بۆ چوونی زانای پایە بەرز (محمد بن صالح العثيمين)یشە ڕەحمەتی خوای لێبێت.

## ئایا بۆ گوێزەبانە بێجگە لە مەڕو بزن ئاژەڵی تریش دەبێت؟

زانایان بۆچونیان جیاوازە: کە ئایا جگە لە مەڕو بزن ئاژەڵی تر دروستە بکرێت بە گوێزەبانە؟

(ابن منذر) دەفەرموێت: بۆچونی زانیان جیاوازە دەربارەی گوێزەبانەکردن بە ئاژەڵی تر واتە جگە لە مەڕو بزن، وە ڕیوایەتمان کردوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە : کە بە وشتر گوێزەبانەی کردوە بۆ منداڵەکەی.

هەروەها لە ئەبی بەکرەوە ڕیوایەت هاتوە: کە بۆ عبدالرحمنی کوڕی وشتری سەربڕیوە، وە زۆرێک لە خەڵکی بەصرەی بانگ کردوە و لێیان خواردوە.

هەر (ابن منذر) دەفەرموێت: لەوانەیە بەڵگەی ئەوانەی کە دەڵێن گوێزەبانە بە وشتر و مانگا دروستە، ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر بێت(ﷺ) کە دەفەرموێت: ((منداڵ گوێزەبانەی

خۆی لەگەڵدایە، خوێنێکی لەباتی بڕێن))، وە باسی جۆری ئەو خوێنەی نەکردوە و جیای نەکردوەتەوە لە جۆرێکی تر (واتە باسی ئەو ئاژەڵەی نەکردوە کە چی بێت)، کەواتە هەر ئاژەڵێك سەر ببڕدرێت بۆ ئەو منداڵە بە پێی ڕوکەشی ئەم فەرمودەیە دروستە.

وە پاشان دەڵێت: ((وە دەشێت کەسێك بڵێت: ئەم فەرمودەیە (موجمەلە)، وە ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێت: ((بۆ کوڕ دو مەڕ، وە بۆ کچ یەك مەڕ))، ڕونکەرەوەی ئەو فەرمودەیە بێت، وە ئەوش کە ڕونترە لە پێشترە تا ئەوەی کە ڕون نیە[٣٥].

بەڵام لە فەرموودەکاندا تەنها ناوی مەڕ و بزن و بەران هاتووە ئەمەش مانای وایە کە تەنها دوو جۆر دەبێت بۆ گوێزەبانە، وە ئەوەش هەمان بۆچونی (ابن عباس و عائیشة و ئیمامی شافعیواحمد و اسحاق و ابی ثور، هەروەها ابو شیخ الاصبهانیة)یە.

---

[35] تحفة المودود لابن القيم، ص:(١٣٦_١٣٧).

ئەبی مولەیکە دەفەرمووێت: ((نفس لعبدالرحمن بن أبي بکر غلام فقيل لعائشة يا أم المؤمنين عقي عنه جزورا، فقالت: معاذ الله، و لكن ماقال رسول الله: ((**شاتان مكافئتان**))[36].

واتە: عبدالرحمنی کوڕی ئەبو بەکر منداڵێکیان بوو، گوێزەبانەیان بۆ کردوو بە عائیشەیان_ڕەزای خوای لێبێت_ ووت: ئەی دایکی ئیمانداران ووشتری بۆ کردووە بە گوێزەبانە، ئەویش فەرمووی: پەنا بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەیفەرمووە: ((دوو مەڕی هاوچەشن)).

کۆمەڵێك لە زانایان دەفەرموون کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: ((بۆ منداڵی کوڕ دوو مەڕ، وە بۆ کچ یەك دانە))، واتە: بەهیچ شێوەیەك دروست نییە لە غەیری (مەڕ و بزن) بەکار بهێنرێت بۆ گوێزەبانە وە ووشترو مانگا لە بریان ناکرێت بە گوێزەبانە.

---

36 حسن: أخرجه الطحاوي في(( المشكل )) (١\٤٥٧)، و البيهقي(٩\٣٠١)، و إسناده حسن كما قال الإمام الألباني في ((الإرواء))(٤/٣٩٤).

هەروەها حافظ ابن حجر دەفەرمووێت[٣٧]: ((بە بۆچوونی من تەنها مەڕو بزن دروستە، لەگەڵ ئەوەی زۆرێك لە زانایان دەڵێن غەیری مەڕو بزن دروستە، وەكو ووشترو مانگا، بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیەیە كە(ئەنەس) بەمەرفوعی دەفەرمووێت: ((**يعق عنه من الإبل والبقر والغنم**)[٣٨]، واتە: گوێزەبانەی بۆ دەكرێت لە ووشترو مانگاو مەڕو بزن، بەڵام ئەم فەرموودەیە لاوازە هەروەك ئیمام ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێت لە ((الإرواء)) (٣٩٣/٤) دا.

## كاتی سەربڕینی ئاژەڵەكە كەیە؟

هەموو ئەو فەرموودانەی كە هاتووە باسی ئەوە دەكەن كە سەربڕینی حەیوانەكە دەبێت حەوتەم ڕۆژ بێت هەروەك لە فەرموودەكەی (سەمورە)، هەروەها فەرموودەكەی (عمرو بن

---

37 (فتح -٩ /٧٤٠).

38 وهو عند الطبراني و أبي الشيخ.

شعيب عن ابيه عن جده): ((**أمر بتسمية المولود يوم سابعه ووضع الأذى عنه والعق**)).[39]

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی کرد بە ناونانی منداڵ لە ڕۆژی حەوتەمیدا و تاشینی سەری و گوێزەبانەکردن بۆی.

کەواتە دروست نیە ئەنجامدانی گوێزەبانە لە پێش حەوتەم ڕۆژ، یان دواخستنی چونکە ئەو کاتە کاتێکی دیاری کراوە بۆ ئەو عیبادەتە.

بەڵام ئەگەر نەیتوانی لە حەوتەم ڕۆژدا، ئەوا دروستە لەهەر کاتێکی تردا ئەنجامی بدات بەبێ ئەوەی تایبەتی بکات بە ڕۆژێکەوە، وەکو چواردەهەم ڕۆژو بیست و یەکەم ڕۆژ، چونکە ئەو فەرموودەیەی کە دەڵێت گوایە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووبێتی: ((**تذبح لسبع ولأربع عشرة ولإحدى و عشرين**)).

---

[39] حسن: اخرجه الترمذی(٢٨٣٢)، وابن شيبه(٥٢/٨)، و حسنه الإمام الالبانی رحمه الله في صحيح سنن الترمذی (٣٧١/٢)برقم:(٢٦٩) وهذا لفظ الترمذی.

واتە: حەوتەم ڕۆژو و چواردەیەم ڕۆژو و بیست و یەکەم ڕۆژ دروستە سەربڕینی حەیوانەکە، چونکە ئەم فەرموودەیە لاوازە و نابێتە بەڵگە[40].

وە دەربارەی حیکمەتی سەربڕینی منداڵ لە حەوتەم ڕۆژدا یبن قەیم_ڕەحمەتی خوای لێبێت_دەفەرموێت: ((حیکمەت تێیدا_خواش زاناترە_ ئەوەیە کە منداڵ کاتێك لەدایك دەبێت مانەوەی لەنێوان لەش ساغی و نەخۆش کەوتنی و مردنی ناجێگیرە، وە نازانرێت کە ئایا لەوانە دەبێت کە دەژی یان نا؟ هەتا ماوەیەك دێت بەسەر لەدایك بونیدا کە بەهۆیەوە بتوانرێت شایەتی بۆ بدرێت لەسەر ساغی لاشەی و تەندروستی جەستەی، وە بوترێت کە

---

[40] ضعيف: وهو من حديث بريدة الأسلمي، أخرجه الحسين بن يحيى بن عياش أبو عبدالله القطان في ((حديثه))(من٥٩/١) وعنه البيهقي في ((السنن))(٩/ ٣٠٣) والطبراني في ((المعجم الصغير))(ص:١٤٩)، و ((الأوسط))(١/١٣٤) من طريق إسماعيل ابن مسلم عن قتادة عن عبدالله بن بريدة عن أبيه به، وله طريق آخر من حديث السيدة عائشة أخرجه الحاكم(٤/٢٣٨_٢٣٩). فالحديث ضعيف الإسناد كما قال الإمام الالبانى رحمه الله في ((الارواء))(٤/٣٩٥).

ئومێدی ژیانی لێدەکرێت، وە خوای پەروەردگار ئەو ماوەیەی بە حەوت ڕۆژ دیاری کردوە، چۆنکە هەفتە بە تێپەڕ بونی ڕۆژ دروست دەبێت، وە ساڵیش بە تێپەڕ بونی مانگ.

وە ئەم حەوت ڕۆژەش ئەو ماوەیەیە کە خوای گەورە بڕیاریدا کە ئاسمان و زەوی تێدا دروست بکات،...وە ڕۆژی تەواو بونی دروست کراوەکانی کردە ئەو ڕۆژەوە، وە ڕۆژی کۆبونەوەی دروست کراوەکانە و جەژن ئیماندارانە، تێیدا کۆدەبنەوە بۆ پەرستنی و یاد کردنی، و باس کردنی، حەمد کردنی،...وە باس کردنی ئەو شتانەی لە کۆتای هەفتەدا ڕویداوە لە سەرەتای دروست بونی دونیا، وە ئەوەش کە ڕوو دەدات تێیدا لە ڕۆژی گەڕانەوەدا، هەروەها حەوتەم ڕۆژ ئەو ڕۆژەیە کە خوای پەروەردگار لەسەرو هەرشەکەیەوە بەرزبویەوە، وە ئەو ڕۆژەیە کە خوای گەورە باوکمان ئادەمی تیا دروست کرد، وە ئەو ڕۆژەیە کە تێیدا جێگیر بو لەناو بەهەشتدا، وە هەر لەو ڕۆژەشدا دەری کرد لەناو بەهەشت، وە هەر لەو ڕۆژەشدا دونیا کۆتای پێ دێت، وە قیامەت

هەڵدەسێت، وە هەر لەو ڕۆژەدا خودا موساو گەلەکەی ڕزگار کرد، وە هەر لەو ڕۆژەدا خودا دێت و لێپرسینەوە لە بەندەکانی دەکات، وە لەو ڕۆژەدا خەڵکی بەهەشت دەچنە ناویەوە، وە خەڵکی دۆزەخ دەچنە ناو دۆزەخەوە[٤١].

## بەمەرج نەگیراوە ئەو کەسەی کە گوێزەبانەکە دەکات حەیوانەکە بەدەستی خۆی سەربب‌ڕێت

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: (یذبح)، ئەم کردارە کە سەربڕینە بکەر نادیارە، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە مەرج نیە ئەو کەسەی کە حەیوانەکە سەردەبڕێت دەبێت خاوەن گوێزەبانەکە بێت بەڵکو دەگونجێ کەسێکی تری شارەزا سەری ببڕێت.

## کێ دەبێت هەستێت بە ئەنجامدانی گوێزەبانە؟

گوێزەبانە سوننەت وایە باوك پێی هەستێت، بەلآم ئەگەر باوکی نەمابوو ئایا خزمە نزیکەکانی بۆی دەکەن یاخود دایکی؟ لێرەدا دەڵێین ئەگەر ئەو منداڵە پێش لەدایك بوونی،

---

[41] تحفة المودود لابن القيم الجوزية_رحمه الله_ (ص:١٥٦_١٥٧).

باوكی وەفاتی كرد، لەو كاتەدا دایكی لێپرسراویەتی وەردەگرێت و لە جیاتی باوكی منداڵەكەی هەڵدەستێت بە ئەنجام دانی گوێزەبانە بۆی.

وەئەمە بۆچوونی شافیعی مەزهەبەكانە كە دەڵێن: گوێزەبانە حەقێكە لە ئەستۆی ئەو كەسەدایە كە هەڵدەسێت بە بەخێوكردنی منداڵەكە لە ڕووی خواردن و جل و بەرگ و جێگاوە، هەروەها حەنبەلی مەزهەبەكان دەڵێن: گوێزەبانە حەقێكە لە ئەستۆی باوك دایە، ئەگەر مرد یان نەیتوانی ئەوا كەسێكی تر.

وە ئەو فەرموودەیەی كە باسی سەربڕینی حەیوان دەكات لەلایەن پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بۆ حەسەن و حوسێن، واتە ئەو هەستاوە بە كردنی گوێزەبانەكە، ئیمامی ((نەوەوی))_ڕەحمەتی خوای لێبێت_لێكدانەوەی بۆ فەرموودەكە بەوجۆرەیە كە دەفەرموێت: ((دەگونجێ لەو كاتەدا ئیمامی عەلی هەژار بوو بێت یاخود لەو حەقەی خۆی خۆش بوو بێت بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، یاخود (عق)

بەمانای فەرمان بێت، واتە فرمانی کردووە بەسەر بڕینی دوو حەیوان بۆ هەریەکە لە حەسەن و حوسێن (خوا لێیان ڕازی بێت)، یاخود ئەو کارەی پێغەمبەر(ﷺ) تایبەتی خۆیەتی هەروەك چۆن هەستاوە بەقوربانی کردن لە باتی ئەو کەسانەی کە ناتوانن قوربانی بکەن لە ئومەتەکەی[٤٢].

## هەبوونی توانای لە ئەنجامدانی گوێزەبانە (القدرة)

زانایانی شافیعی مەزهەب بە مەرجیان گرتووە ئەو کەسەی کە گوێزەبانە دەکات دەبێت توانایی و دەسەلآتی هەبێت، حەنبەلیەکان دەفەرموون: سوننەت وایە باوك هەستێت بەو کارە با هەژار و کەم دەستیش بێت، وە قەرز دەکات ئەگەر توانای دانەوەی هەبوو، **ئیمامی ئەحمەد** دەفەرمووێت: ((ئەگەر پارەی نەبوو هەتا گوێزەبانە بکات، دەتوانێت قەرز بکات، وە داواکارم لەخوای گەورە جێگەی ئەو پارەیە پڕ بکاتەوە، لەبەر ئەوەی ئەو کەسە هەستاوە بەزیندوو کردنەوەی سوننەتێکی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

---

42 ( فتح الباري: جزء ٩،ص: ٧٣٧).

بەڵام ئەوەی کە ڕوون و ئاشکرایە لەلای هەموان ئەوەیە کە هەموو عیبادەتێك کە شەرع فەرمانی پێکردووە هەبوونی تواناو دەسەڵات تێیدا ڕەچاو کراوە، چونکە ئاینی ئیسلام ئاینی ئاسانی و ئاسودەی و خۆشیە نەك قورسی و ناڕەحەتی و زۆر لێکردن. کەواتە کەسێکی هەژار کە توانای نیە مەرجە گوێزەبانەکە لە کاتی خۆی دا بکات؟ شێخ عیثیمین_ڕەحمەتی خوای لێبێت_دەفەرموێت: دەڵێین ئەگەر ئەو کەسە هەژار بوو وە نەیتوانی گوێزەبانە بکات مەگەر ئەوەی کە قەرز بکات، لەم حاڵەتەدا ئێمە پێی ناڵێین بڕۆ قەرز بکە، وە ئەگەر نەتوانینەکەی بۆ ماوەیەکی کاتی بوو، واتە دەیتوانی پاش ماوەیەك گوێزەبانە بکات، وەکو ئەو فەرمانبەرەی کە مووچە وەردەگرێت: بۆ نمونە یەکێك لەو فەرمانبەرانە منداڵیان دەبێت لە ناوەڕاستی مانگدا، بەهۆی ئەوەی کە مووچەکەی تەنها بەشی ڕۆژانەی ژیانی دەکات لەو کاتەدا پارەی ئەو تۆی پێ نیە، بەڵام سەری مانگ مووچە وەردەگرێت وپارەی پێدەبێت، لەم حاڵەتەدا ئایا

گوێزەبانەکە بەقەرز بکات یاخود چاوەڕێ بکات تاسەری مانگ بە پارەی خۆی بیکات؟

**شێخ عثیمین**_ڕەحمەتی خوای لێبێت_ دەفەرموێت: ((چاکتر وایە کە چاوەڕێ بکات تا سەری مانگ، چونکە بەو جۆرە چاکترە و حەقی کەس نایەتە گەردنی، چونکە مرۆڤ نازانێت لەماوەی نێوان لەدایك بوونی منداڵی، تا سەری مانگ چی لێ بەسەر دێت، بۆ نمونە: نەخۆش دەکەوێت، یان سەیارەکەی دەشکێت، کە ئەمانە هەمووی پارەی دەوێت، کەواتە باشتر وایە کە قەرز نەکات، چاوەڕێ بکەو پەلەت نەبێ.

## ئایا رۆژی حەوتەم لەیەکەم ڕۆژی لەدایك بوونی منداڵەوە حساب دەکرێت؟

(حەوتەم ڕۆژ) واتە لەیەکەم ڕۆژی لەدایك بونیەوە؟ وە ئایا یەکەم ڕۆژی لەدایك بوونی حسێب دەکرێت؟

(ابن عبد البر) دەفەرموێت: ((ئیمامی مالیك پوختەی قسەی ئەوەیە کە ئەو حەوت ڕۆژە دەست پێ دەکات لە

ڕۆژێـك لـەدوای لـەدایك بـوونی، بـەڵام ئەگـەر هـاتوو پـێش هەڵهاتنی بەرە بەیانی ئەو ڕۆژە لە دایك بوو ئـەو ڕۆژەی بۆ حـسێبە، بەهـەمان شـێوە (البـوطي) هـەمان بـۆ چـوونی لـە ئیمامی شافعیەوە نقلّ کردووە.

## دروستە پیاو یاخود ئافرەت گوێزەبانە بۆ خۆی بکات ؟

بـەڵێ دروسـتە گوێزەبانـە بـۆ خۆیـان بکـەن مـادەم بـە منداڵی بۆیان نەکراوە.

(ئەنەس) لە پێغەمبەری خـواوە(ﷺ) بۆمـان دەگێڕێتـەوە کە دەفەرموێت: **((عق عن نفسه بعدما بعث بالنبوة))**[٤٣].

واتە : پێغەمبەر (ﷺ) گوێزەبانەی بۆ خۆی کرد لەدوای ئەوەیکە بوو بە پێغەمبەر (ﷺ).

**(رافعي)**دەفـەرموێت: ((ئەگـەرمنـداڵ گەیـشتە تەمـەنی پێگەشتن (بلوغ)، وە ئەوکەسەی کە پێویستە گوێزەبانەی بۆ

---

[43] حسن: أخرجه الطحاوي في ((المشكل)) (٤٦١/١)، و الطبراني في ((الأوسط)) (١/ ٥٢٩)، و أبو الشيخ في ((العقيقة))، وابن حزم في ((المحلى))(٥٢٨/٧)، والضياء المقدسي في ((الأحاديث المختارة))(٥/٢٠٤_٢٠٥/١٨٣٢و١٨٣٣)، وحسنه شيخنا الألباني_رحمه الله_ في ((الصحيحة))(٥٠٢/٦_٥٠٦).

بکات بۆی نەکرد بوو، ئیتر ناتوانێت گوێزەبانەی بۆ بکات، بەلاَم خۆی دەتوانێت گوێزەبانە بۆ خۆی بکات، **(ابن سيرين)** دەفەرمووێت: ئەگەر بزانم گوێزە بانەم بۆ نەکراوە ئەوا خۆم بۆ خۆمی دەکەم، وە( **قفال**)یش ئەم بۆچوونەی بەلاوە پەسەندە.

وە ئیمامی ئەحمەد_ڕەحمەتی خوای لێبێت_ دەربارەی کەسی گەورە کە خۆی بۆخۆی بکات بەچاکی زانیوە، هەروەك لە ((مسائل الميموني))یدا هاتوە.

خۆ ئەگەر بوترێت: با ئەو فەرمودەیەش ڕاست بێت دەگونجێ ئەو کارە تایبەتی پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بێت، هەروەکو وتوتراوە دەربارەی قوربانی کردنی بۆ ئەو کەسانەی ناو ئوممەتەکەی کە ناتوانن قوربانی بۆ خۆیان بکەن لەبەر هەژاری، کە ئەو کارەی تایبەتی خۆیەتی[٤٤].

لە وەلاَمدا دەلێین: ئەم ئەگەرە پەسەند نیە لەبەر دو هۆکار:

---

[44] قاله الحافظ ابن حجر_رحمه الله_ في((فتح الباري))(٩/٥٩٥).

١_ئەو شتانەی کە تایبەتن بە پێغەمبەرەوە(ﷺ) پەیوەستن بە بونی بەڵگەوە، واتە بەڵگەیەکی ڕاست و ڕاشکاوانە هەبێت لەسەر ئەوەی کە ئەو کارە تایبەتی خۆیەتی.

٢_هەندێك لە زانایان و پیاوچاکانی پێشین کاریان بە فەرمودەکەی ئەنەس کردوەو وە فەتوایان پێداوە، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو کارە تایبەتی پێغەمبەر(ﷺ) خۆی نیە، ئەوەتا موحەممەدی کوڕی سیرین دەفەرموێت: ((ئەگەر بزانم گوێزەبانەم بۆ نەکراوە، ئەوا خۆم گوێزەبانەم بۆخۆم دەکرد))[٤٥].

وە حەسەنی بەصری دەفەرموێت: ((ئەگەر گوێزەبانەت بۆ نەکرابو، ئەوا خۆت بۆخۆتی بکە، ئەگەر بو بویت بە پیاویش واتە گەورە بوبویت))[٤٦].

---

[45] أخرجه ابن ابي شيبة في ((المصنف))(٨/٢٣٥_٢٣٦/٤٢٨٨).

[46] أخرجه ابن حزم في ((المحلى))(٨/٣٢٢)بإسناد حسنه شيخنا_رحمه الله_ في ((الصحيحة))(٦/٥٠٦).

## واتای ووشەی ( مكافئ ) چیە ؟

عن ام كزر الكعبية قالت: سمعت رسول الله(ﷺ) يقـول: **((عن الغلام شاتان مكافئتان{مكافأتان}، و عن الجارية شاة)).** قـال ابـوداود: سمعـت احمـد قـال: ﴿مكافأتـان﴾ مكافئتـان، مستوتيان أو متقاربتان ﴿مقاربتان﴾.

واتە: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو(ﷺ) دەیفـەرموو: بـۆ منـداڵی تـازە لـەدایك بـوو ئەگـەر كـوڕ بـوو ئـەوا دوومـەڕی هاوچەشن وە بۆ كچ یەك مەڕ، ئەبو داود دەفەرمووێت: گوێم لەئیمـامیئەحمـدبـوودەیفـەرموو: مەبەسـتی بـە (مكافئتـان) واتە: لەیەكەوە نزیك بن، هاوچەشن بن.

وە (داود بن قـیس) دەفـەرمووێت: ((پرسـیم لـە زەیـدی كـــوڕی ئەســـلەم دەربـــارەی ووشـــەی(مكافئتـان) لـــە فەرموودەكەدا، ئەویش فەرمووی واتە لەیەكەوە نزیك بن.

هەروەها شێخ (محمد بن صالح العثيمين)_ڕەحمەتی خوای لێبێت_دەفەرمووێت: ((وە پێویستەئەو دوومەڕەیكە

سەردەبڕرێت هاوچەشن بن لە ڕووی تەمەن و قەبارە و وێك چوون و قەڵەوی یەوە، وە هەتا لەیەکەوە نزیکتر بن چاکترە.

وە (خطابي) دەفەرمووێت: ((واتە هاوتابن لەتەمەندا، بەلأم لە هەموو ئەو بۆچوونانە بەهێزترو لە پێشتر ئەو بۆ چوونەیە کە (سعيد بن منصور) ڕیوایەتی کردووە لە فەرموودەکەی (ام كرز) لە (عبدالله بن ابي زيد) کە ئەمە دەقەکەیەتی: ((**شاتان مثلان**))، واتە: دوور مەڕی هاوچەشن، لە ڕوایەتێکی تردا کە (طبراني) هێناویەتی: ((قيل: ما المكافئتان؟ قال: المثلان)).

## پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (أميطوا عنه الأذى) واتە نارەحەتی لێ دوور بخەنەوە

ئەبو داود ڕیوایەت دەکات لە (سعيد بن ابي عروبة وابن عون عن محمد سيرين) کە دەفەرمووێت: ئەگەر مەبەستی بە ووشەی (الأذى) تاشینی سەری منداڵەکە نەبێت ئەوا نازانم دەبێت چی بێت، (الأصمعي) فەتوای داوە بەوەی کە ئەو نارەحەتیە بریتیە لە تاشینی سەری، هەروەها (حەسەن)یش

هەمان بۆچونی هەیە[47]، هەروەها دایکی ئیمانداران عائیشە دەفەرموویت: ((**وأمر أن يماط عن رؤوسهما الأذى**))[48].

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی کرد بەوەی کە سەری منداڵی تازە لە دایك بوو بتاشرێت و ئەو ئازار ناڕەحەتیەی لێ دوور بخرێتەوە، بەلاّم ئەم فەرموودەیە لاوازە و نابێت بە بەلگە هەروەك ئیمامی ئەلبانی دەفەرموویت[49]، بەلاّم مەرج نیە مەبەستی بەلابردنی ئازارو ناڕەحەتی تەنها لابردنی قژی منداڵەکە بێت، ئەوەتا ئیبن عەبباس_ڕەزای خوای لێبێت_دەفەرموویت: ((**ويماط عنه الأذى و يحلق رأسه**))[50].

---

[47] (كما اخرجه ابو داود بسند صحيح عنه).

[48] اخرجه البيهقي في ((الكبرى))(٨/ ٣٢٢)، وفي الشعب(٨٦٣٨)، واحمد في ((المسند))(٦/١٥٨ - ٢٥١)، وابن حبان(٧/٣٥٦)، و الحاكم في المستدرك (٤/٢٣٧) وغيرهم.

[49] بڕوانە: الارواء (٤/٣٨١)

[50] رواه الطبراني في ((الأوسط)) (١/٣٣٤ - ٣٣٥).

واتە: ئەو ناڕەحەتی و ئازارەی لێ دوور دەخرێتەوە و سەری بۆ دەتاشرێ، بەڵام ئەم فەرموودەیەش قسەو باس لەسەر سەنەدەکەی هەیەو یەکێك لە ڕاوی فەرموودەکە کە (رواد بن الجراح)ە ضەعیفە.

بەڵام وەڵامی ڕاست و دروست ئەوەیە کە (إماطة الاذى)، بەتاشینی سەری منداڵی تازە لە دایك بوو لێك بدرێتەوە، لەبەر ئەوەی هیچ کام لەو فەرموودانەی سەرتاشین و لابردنی ئازارو ناڕەحەتی بەیەکەوە هێناوە صەحیح نین، وە پێغەمبەری خواش(ﷺ) کە دەفەرمووێت: ((عن الغلام شاتان وعن الجارية شاة))، واتە: ((بۆ منداڵی کوڕ دوو مەڕ سەربڕن، وە بۆ منداڵی کچ یەك دانە)) ئەمەیان تەفسیری: ((أهريقوا عنه دما))، واتە: ((خوێنێکی بۆ بڕێژن))، کەواتە: تاشینی سەر تەفسیری: ((وأميطوا عنه الأذى)يە، واتە: ((ناڕەحەتی و ئازاری لێ دور بخەنەوە)).

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ((مرتهن بعقيقته))**

**واتە ئەو منداڵە بارمتەیە هەتا گوێزەبانەکەی بۆ نەکرێ**

دەربارەی ئەم بەشەلەفەرموودەکە زانایان جیاوازیەکی زۆریان هەیە، (خطابي) دەفەرمووێت: ((زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی تێگەیشتن لەم بەشەی فەرموودەکە، وە باشترین بۆچوونێك کە دەربارەی ئەم مەسەلەیە هاتبێت، ئەو بۆچوونەی ئیمامی ئەحمەدە کە دەفەرمووێت: ((بارمتە واتە لەکاتی شەفاعەت کردندا ئەو منداڵە ناتوانێ شەفاعەت بۆ دایك و باوکی بکات))، هەندێك لە زانایان دەفەرموون: واتایئەوەیە کە گوێزەبانە پێویستە و هەردەبێت بۆی بکرێت، وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو منداڵەیشوبهاندووەبە بارمتەیەك کە لە دەستی بارمتەگردایە و دەستی بەسەردا گرتووە، واتە ئەو منداڵە بارمتەیە لەلای ئەو گوێزەبانەیە هەروەك چۆن بارمتەیەك لەلای بارمتەهەلگرە، وە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر واجبێتی گوێزەبانە.

وە (عطاء بن أبي رباح) دەفەرموێت: ((واتە: ئەو دایك و باوكە بێ بەش دەبن لە شەفاعەتی منداڵەكەیان)).

وە لـە سـودەكانی گوێزەبانـە ئەوەیـە كـە قوربانیەكـە بەهۆیەوە مرۆڤ نزیك دەبێتەوە لە خوا لە جیاتی ئەو منداڵەی كـە لـەدایك بـوە لەسـەرەتای هاتنـە نـاو دونیایـەوە، وە منداڵەكەش ئەوپەڕی سودی لێ وەردەگرێ، هـەروەك چـۆن سود لەو دۆعایە وەردەگرێ كە بۆی دەكرێت.

هەروەها لەسـودەكانی ئەوەیـە كـە ئـەو منداڵـە ڕزگـاری دەبێت لەو بارمتەییەی كە تێیدایەتی.

هـەروەها فیدیەیەكـە كـە لـەباتی ئـەو منداڵـە دەدرێـت، هەروەكو ئەو فیدیەیەی كە خودای گەورە ناردی لـە جیـاتی ئیسماعیل(سـەلامی خـوای لەسـەربێت) كـە بـەرانێك بـو، وە خەڵكانی پێش ئیسلام ئەم گوێزەبانەیەیان دەكرد، وە سەری منداڵەكەیان سور دەكرد بە خوێنی ئاژەڵەكە، وە كە ئیـسلام هـات پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) ئـەم كـارەی وەكـو خـۆی هێشتەوەو كە سـەربڕینی ئاژەڵێكـە، وە نـاوی لـە(عقیقـە)وە

گـۆڕی بـۆ (نـسیکە)، وە فـەرموی: ((بـەهیچ جۆرێـك سـەری منداڵەکە سور نەکەن بە خوێن)).

وە پێغەمبـەر(ﷺ) پێـی ڕاگەیانـدوین کـە دەبێـت ئـەو سەربڕینە وەکو عیبادەت ئەنجام بدەین، هەروەکو قوربـانی، وە بەدور نیە لە حیکمەتی خوداوە لەڕوی شەرع و قەدەرەوە کە ئەم گوێزەبانە ببێتە هۆی جوان گەشە کردنی ئەو منداڵە، وە بەردەوام سەلامەت بونی، وە درێژی تەمەنی و پارێزراوی لە شەیتان، هەتا بە هەر ئەنـدامێکی ئـەو ئاژەڵـە ئەنـدامێکی ئەو منداڵە ڕزگاری دەبێت لە ناڕەحەتی[٥١].

## تـاشینی سەری منداڵی لەدایك بوو

دەربارەی تاشینی سەری منداڵ لەدوای لەدایك بوونی لە چەند فەرموودەیەکدا فەرمانی پێکراوە:

١- فەرموودەکەی (سمرة): وە تێیدا هاتوە کە: ((... ويحلق رأسه ...))، واتە: وە سەری بۆ دەتاشرێت.

---

[51] تحفة المودود لابن القيم، ص:١١٩_١٢٠.

٢- فەرموودەکەی (علي): وە تێیدا هاتوە کە: ((... یافاطمة احلقي رأسه...)).، واتە: ئەی فاگمە سری بۆ بتاشە.

٣- فەرموودەکەی (عمرو): وە تێیدا هاتوە کە: ((...ووضع الأذى عنه)).، واتە: وە ناڕەحەتی لیّ دور دەخرێتەوە.

کەواتە هەموو ئەم فەرموودانە بەڵگەیە لەسەر واجبێتی تاشینی سەری منداڵ، چوونکە بەشێوەی فەرمان کردن هاتووە لەلایەن پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، وە دەبێت ئێمەش جێبەجێی بکەین، وە هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان منداڵی کوڕ وکچدا لەبەر ئەوەی فەرمانەکە گشتی یە، وە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((إنما النساء شقائق الرجال))[52]. واتە: ئافرەتان هاوشێوەی پیاوانن.

وە (أبو عمرو بن عبدالبر) دەفەرموێت[53]: ((وە دەربارەی سەرتاشینی منداڵ لە کاتی گوێزەبانەدا، ئەوە زانایان بە سوننەتیان دەزانی، وە فەرمودەی صەحیحیش لە

---

[52] صحيح: رواه الدارمي وغيره وانظر سلسلة الأحاديث الصحيحة(ح:٢٨٦٣).

[53] في ((التمهيد))(٤/٣١٨).

پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتوە کە لە فەرمودەکەی گوێزەبانەدا فەرمویەتی: ((وە سەری دەتاشرێت، و ناوی لیّ دەنرێت)).

وە محمدی کوڕی علی دەڵێت: صالح بۆی گێڕاینەوە: کە باوکی وتویەتی_ئیمامی ئەحمەد_: سوننەت وایە کە سەری ئەو منداڵە بتاشرێت لە ڕۆژی حەوتەمیدا[54].

## کاتی سەرتاشینەکە

پێغەمبەری‌خوا(ﷺ)بۆی‌دیاری‌کردووین کە تاشینی سەری ئەومنداڵەدەبێت‌حەوتەم ڕۆژی لەدایك بوونی‌بێت، وەك لەفەرموودەکاندا هاتوو.

## (قزع) حەرامە

قزع: بریتیە لە تاشینی بەشێك لە سەری منداڵ، وە نەتاشینی بەشەکەی تری.

وە دەبارەی (قزع) چەند فەرموودەیەك هاتووە لەوانە:

---

[54] قاله الخلال في((الجامع)) ذكر حلق رأس الصبي، والصدقة بوزن شعره.

عن إبن عمر (رضي الله عنه) أن النبي(ﷺ) رأى صبيا حلق بعض رأسه و ترك بعضا فنهى عن ذلك و قال : ( **احلقوا كله أو اتركوه كله** )[55].

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) منداڵێکی بینی کە بەشێك لە سەری تاشرابوو وە بەشەکەی تری دەستکاری نەکرا بوو، ئەویش نەهی لێکردن لەو کارە و فەرمووی: ((یان هەموو قژی سەری بۆ بتاشن یان دەستکاری مەکەن)).

کەواتە دروست نیە تاشینی بەشێك لە سەر ونەتاشینی بەشەکەی تری، بەهەمان شێوە کورت کردنەوەی بەشێکی سەرو دەستکاری نەکردنی بەشەکەی تری وەك (حەفر).

وە یبن قەیم_ڕەحمەتی خوای لێبێت_دەفەرموێت: ((مامۆستامان_واتە ئیبن تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێبێت_ دەفەرموێت: وە ئەم فەرمایشتە لە تەواوێتی خۆشویستنی

---

[55] اخرجه البخاري(٥٩٢١,٥٩٢٠)، ومسلم(٢١٢٠)، و أبوداود(٤١٩٥)، و النسائي(٨\١٣٠)، و ابن حبان(٥٤٨٤)، و البغوي في ((شرح السنة))(١٢\٩٩).

خــوداو پێغەمبەرەکەیــەتی(ﷺ) بــۆ دادپــەروەری، وە فەرمانیان بە دادپەروەری کردوە تەنانەت دەربارەی مرۆڤ لەگەڵ نەفسی خۆیدا، بەوەی کە قەدەغەی کردوە لەوەی کە بەشێك لەسەری بتاشێ و واز لەوەی تری بهێنێ، چونکە ئەوە ستەمە لە سەری مرۆڤ.

وە هاوشێوەی ئەمە: ((ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کردوە لە دانیشتن لە نێوان هەتا و سێبەردا))، چونکە ستەمە لە بەشێك لە جەستە.

وە هەروەها: ((نەهی کردوە لەوەی کە مرۆڤ بەڕێدا بڕوات لە کاتێکدا کە یەك تاك پێلاوی لە پێدا بێت، بەڵکو دەبێت یان هەردو تاکەکەی لە پێ بکات، یان بە پێ خاوسی بڕوات)).

وە (قزع) چوار جۆری هەیە:

یەکەمیان: ئەوەیە کە هەندێك بەش لە سەری بتاشێت لێرەو لەوێ، کە ئەمەش لە (تقزع السحاب)وە هاتوە واتە پەرشو بڵاوی هەوری ئاسمان.

دوەم: ئەوەیە کە ناوەڕاستی سەری بتاشێ و واز لەملاو لاکەی بهێنێ.

سێیەم: ئەوەیە کە ئەملاو لای سەر بتاشێ و واز لە ناوەڕاستەکەی بهێنێ.

چوارەم: ئەوەیە کە پێشی سەری بتاشێ و واز لە پشتە سەری بهێنێ.

ئەمانە هەموی (قزع)ن، واللە أعلم[٥٦].

## بەخشینی زیو بەقەدەر کێشی قژی لەدوای تاشینی

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد بە(فاطمة)ی کچی کە بەقەد وەزنی قژی حەسەن زیو بکرێت و بیکات بە خێر، کە دەفەرموێت: ((**یا فاطمة احلقي رأسه و تصدقي بزنة شعره فضة، قال: فوزناه فكان درهما أو بعض درهم** ))[٥٧].

---

[56] تحفة المودود لابن القيم، ص:١٦٤_١٦٥.

[57] حسن: أخرجه الترمذي(١٥١٩)، وأحمد(٦\٣٩٠)، والطبراني في((الكبير))(٣\٣٠)، و غيرهم، وحسنه شيخنا الألباني_رحمه الله_ في ((الإرواء))(٤٠٣/٤).

واتە: ئەی فاطمة سەری منداڵەکەت بتاشەو بەقەد کێشی قژەکەی زیو بکڕەو بیکە بەخێر، پاشان فاطمة فەرمووی: منیش قژە تاشراوەکەیم کێشا وابزانم کە بەقەد درهەمێك بوو یان چەند درهەمێك.

لەوانەیە هەندێك بڵێن تاشینی سەری منداڵو کێشانی و کڕینی زیو، وە بەخشینی تایبەتە بەیەکێکەوە کە گوێزەبانە نەکات بۆ منداڵی، بەڵام ((فاطمة_ڕەزای خوای لێبێت_بەردەوام لەدوای ئەوە هەرکاتێ منداڵی ببوایە سەری دەتاشی و بەقەد وەزنی قژەکەی زیو دەبەخشی بەهەژاران))[58].

وە بەهیچ شێوەیەك بەخشینی ئاڵتون دروست نیە چونکە لە فەرموودەکاندا تەنها باسی زیو کراوە، وە ئەوەش بۆچونی حافظ ( ابن حجر )لە فتح الباري (٤/ ١٤٨)دا.

وە کاتی بەخشینی زیوەکە ڕۆژی حەوتەمە چونکە لە فەرموودەکاندا باسی تاشینی سەر دەکات لە حەوتەم ڕۆژدا،

58 اخرجه سعيد بن منصور من مرسل أبي جعفر الباقر صحيحا.

وە ئـەوەش هـەمان بۆچـوونی ئیمـامی‌ئەحمـەدە وە لەبـەر ئەوەی زیو ئێستا مامەڵەی پێ ناکرێ و سکەیەکی ڕەسمی نیە لە ولآتدا هەر بۆیە دروستە بەقەد کێشی قـژی منداڵەکە پارەی ئەمڕۆ بدەیت بە هەژار.

## دروست نیە بەهیچ شێوەیەك خوێنی ئاژەڵەکە بدرێت لەسەری منداڵەکە

عن ابي بريدة أنه قال: ((كنا في الجاهلية إذا ولد لأحدنا غلام ذبح شاة ولطخ رأسه بدمها، فلما جاء الله بالإسلام كنا نذبح شاة ونحلق رأسه و نلطخه بزعفران))[59].

واتە: لەسەردەمی نەفامی و بێباوەڕیدا ئەگەر کەسێك لە ئێمـە منـداڵێکی کـوڕی ببوایـە مـەڕێکی بۆسـەر دەبـڕی و خوێنەکەی دەسووی لەسەری منداڵەکەوە، بـەڵام کاتێـك کـە خوای گەورە ئیسلامی بۆ ناردین و نەفامی نەما، هەڵدەستاین بەسـەربڕینی مـەڕو سـەری منداڵەکـەمان دەتاشـی و لـەباتی

[59] صـــحيح: أخرجـــه ابـــوداود(٢٨٤٣)، والطحـــاوي(١/٤٥٦-٤٦٠)، والحاكم(٤/٢٣٨)، والبيهقي في ((الكبرى))(٩/٣٠٢-٣٠٣).

ئەوەی خوێن بدەین لەسەری منداڵەکە، زەعفەرانمان دەدا لەسەری کە بریتیە لە بۆنێکی خۆش.

وە ئەم فەرموودەیە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە سورکردنی سەری منداڵ بە خوێنی ئەو حەیوانەی کە بۆی سەر دەبڕرێت لە کارو پیشەی سەردەمی نەفامیە و ئەو کارە بە هاتنی ئاینی ئیسلام هەڵوەشاوەتەوە و نەماوە، وە لێدانی زەغفەران یان هەر بۆنێکی خۆش لەسەری منداڵەکە کارێکی چاکە.

هەروەها لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە عائشە (رضي الله عنها) دەفەرمووێت: ((فامرهم النبي ان يجعلوا مكان الدم خلوقا)) [٦٠].

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێ کردین کە لە جیاتی خوێن بۆنی خۆشی بدەین لەسەری منداڵی تازە لە دایك بوو. هەروەها (مهنا بن يحيى الشامي) دەفەرمووێت:

---

[60] صحيح: أخرجه ابن حبان(١٠٥٧)، و عبدالرزاق(٧٩٦٣)، و أبويعلى(٨\ح ٤٥٢١)، و البزار(١٢٣٩– زوائد)، و غيرهم.

((لەلای ئەبو عەبدوڵلا (ئەحمەدی‌کوڕی‌حەنبەل) بووم باسی فەرموودەکەی (یزیدی کوڕی عبدالمزن)یم لە بۆ کرد کە لە بازکیەوە دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: ((**یعق عن الغلام ولايمس رأسه بدم**))[61].

واتە: گوێزەبانە بۆ منداڵ دەکرێت و بە هیچ شێوەیەك خوێن نزیکی سەری ناخرێتەوە، ئیمامی ئەحمەدیش ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرمووی: ((چەند فەرموودەیەکی تەواو و ڕێك و پێکە)).

## یەك لە دوای یەك ئەنجامدانی کارەکان (الترتيب)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرمووێت: ((**يذبح و يحلق و يسمى**))، واتە: حەیوانەکە سەردەبڕێت و سەری منداڵ دەتاشرێت و ناوی‌لێدەنرێت، هەندێك لە زانایان پیتی (و) واویان کردووە بەبەڵگە لەسەر ئەوەی کە مەرج نیە ئەو کارانە یەك لەدوای یەك بکرێت، بەبێ پێش و دوا خستن.

---

61 حسن: أخرجه ابن ماجة(٣١٦٦)، والطحاوي(١/٤٦٠)، و انظر: سلسلة الاحاديث الصحيحة لشيخنا الألباني_رحمه الله_(٢٤٥٢).

بەلاَم لە ڕیوایەتەکەی ئەبی شەیخ لە فەرموودەکەی (سەمورە) هاتووە کە ((**یذبح یوم سابعه ثم یحلق**)).

واتە: حەوتەم ڕۆژ ئەو حەیوانە سەر دەبڕێت و پاشان سەری منداڵەکە دەتاشرێت.

وە **ابن‌جریج** دەفەرمووێت: ((یەکەم جار حەیوانەکە سەردەبڕێت پاشان سەری منداڵەکە دەتاشرێت)[62]، وە بۆچوونێکی (عطاء)ی باس کردووە کە پێچەوانەی ئەو تەرتیبەیە.

ئیمامی (بغوي) لە ((التهذیب))دا دەفەرمووێت: ((سوننەت وایە کەحەیوانەکە سەر ببڕێت ئنجا سەری منداڵەکە بتاشریَ، وەئیمامی نەوەوی لە (شرح‌المهذب)دا ئەو بۆچوونەی هەڵبژاردووە و بەڕاستی داناوە.

## چەند حوکمێکی تایبەت بە گوێزەبانە

**یەکەم:** پێویستە ئەو حەیوانەی بۆ گوێزەبانەکە بەکاردێت (مەڕ بێت یان بزن یاخود بەران).

---

62 اخرجه عبد الرزاق.

**دووەم:** دەبێت ئەو ئاژەڵە ساغ و بێ عەیب بێت، وە عەیبیش جۆری هەیە لەوانە: کوێری دیارو ئاشکرا، نەخۆشی و شەلی و لاوازی زۆر .... هتد.

وە ئیمامی مالیك دەفەرموێت: ((گوێزەبانە هاوتای سەربڕینی (هەدی) و قوربانیە، وە دروست نیە ولآخی کوێر بکرێت بە گوێزەبانە، هەروەها لەڕو لاواز، وە قاچ شکاو، وە نەخۆش، وە نابێت هیچ لە گۆشت و پێستەکەی بفرۆشرێت، وە ئێسقانەکانی دەشکێنرێت، وە خاوەنەکەی لێشی دەخوات و لێشی دەکات بە خێر[٦٣].

**سێهەم :** سورکردنەوە و لێنانی گۆشتەکە چاکترە و باشترە وەك لەوەی هەر بەکاڵی دابەش بکرێت بەسەر خەڵکیدا.

(قسطلاني) دەفەرمووێت: ((سوننەت وایە گۆشتی حەیوانەکە ئامادەبکرێت و لێ بنرێت وەکو هەموو ئەو بۆنانەی کە چێشت وگۆشتیتێدا لێدەنرێت و خەڵکی بۆ بانگ دەکرێت.

---

63 تحفة المودود لابن القيم، ص: ١٣٤.

(عبدالملك الميمونى) دەفـەرمووێت: ((پرسـيم لـە ئيمـام ئەحمەد گۆشتی ئەو حەيوانە لێ دەنرێت؟ فەرمووی: بەڵێ))، هەروەها ئەوە هەمان بۆچونی (عطاء)ە.

وە ئەبوداود دەفەرموێت: لە ئيمام ئەحمەديان پرسی: ئەو ماڵـە لەسـەريان قورسـە بيكـەن بـە خـواردن، فـەرموی: بـا خۆراكربن[٦٤].

وە ئـيبن قـەيم_ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت_دەفـەرموێت: ((لەبەر ئەوەی كە خواردنەكەی لێنا ئەوا ناڕەحەتی لابـردوە لەسەر هەژاران و دراوسێكان كە خۆيان ئامـادەی بكـەن، وە ئەمەش زيادە چاكەيەكە، وە سوپاس كردنی ئەو نيعمەتەيە، وە دراوسێ و منداڵان و هەژاران خۆش حاڵ دەبن پێی، لەبەر ئەوەی ئەگـەر كەسـێك خـواردنێكی پـێش كـەش بكرێـت كـە ئامادەكرابێت بۆ خواردن، خۆشی و شاديەكەی زياترو تـەواو تر دەبێت بـۆی، تـا ئـەوەی كـە بـە كـاڵی بيـدرێتێ و توشـی

64 ((مسائل الإمام أحمد)) لأبي داود (ص٢٥٦).

ناڕەحەتی و خەرجی بێت بۆ ئامادەکردنی، هەربۆیە ئیمام ئەحمەد دەفەرموێت: بابیکەن بە خواردن و خۆڕاگربن[65].

**چوارەم:** دروست نیە کۆبوونەوەی دووکەس یان زیاتر لە کڕینیئاژەڵێکدا بۆگوێزەبان، هەروها دروست نیە سەربڕینی حەیوانێك وەکو گوێزەبانە بۆ دوو منداڵ یان زیاتر، بەڵکو هەر منداڵە و بەشە حەیوانی خۆی بۆ سەردەبڕێت بە تەنها، لەبەر ئەوەی بەڵگەیەکمان نیە هەتا بڵێین دروستە، وە دربارەی ئەوەی کە کەسێك قوربانی بکات و ناوی گوێزەبانەشی لێ بهێنێ لەگەڵیدا، واتە ئاژەڵێك سەرببڕێت بەمەبەستی قوربانی و گوێزەبانە بەیەکەوە، ئەوا ئیمامی ئەحمەد سێ بۆچونی هەیە: یەکەمیان: دروستە و جێگەی هەردوکیانی بۆ دەگرێتەوە، دوەم: تەنها جێگەی یەکێکیان دەگرێتەوە و یەکیانی لەسەر لادەچێ، سێەم: وەستاوە لەو مەسەلەیەدا و فەتوای بە هیچیان نەداوە.

65 ((تحفة المودود)) لابن القيم (ص١٢٦).

بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە هەموو عیبادەتێك لە چۆنیەتی و چەندێتیدا دەبێت بوەستین و لە خۆمانەوە هیچ نەکەین هەتا بەڵگەمان بە دەستەوە نەبێت لە قورئان و سوننەت و وتەی زانایانی پێشین.

**پێنجەم:** دەبێت گوێزەبانەکە سەربڕینی حەیوان بێت، نەك نرخی حەیوانەکە بکرێت بەخێر، واتە پارەدان دروست نیـە، لەبەر ئەوەی سەربڕینی حەیوانەکە لە شەرعدا مەبەستە، وە گوێزەبانەش(سەربڕین) خۆی بۆخۆی عیبادەتە و لە قورئاندا لەگەڵ نوێژدا باس کراوە، وەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: (فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ) الكوثر:(٢)، هـەروەها سـوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بریتیەلە سەربڕینی حەیوانەکـە، وە دروست نیە لە سوننەت و کرداری پێغەمبەر (ﷺ) لابدەین.

وە (سلیمان بـن الأشـعث) دەفـەرموێت: پرسـیار کـرا لـە ئیمام ئەحمەد منیش گوێم لێی بو دەربـارەی حـەوتم: وتیـان

حەوتم بەلاتەوە باشترە یان نرخی ولآخەکە بدرێت هەژاران؟ فەرموی: حەوتمەکەم بەلاوە باشترە[٦٦].

**شەشەم**:سوننەت وایە ئێسقانی ئەوحەیوانەی کە سەردەبڕرێت نەشکێنرێت بەڵکو لە شوێنی جومگەکان لێك جیابکرێتەوە و گۆشتەکەی لێ دابماڵرێت، وە ئیمام ئەحمەد فەتوای بەوە داوە، بە هەمان شێوەش (عطاء و جابر و عائشة) رضي الله عنهم، وە ئیمامی شافعیش ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

بەلآم ئیمامی مالك بەدروستی زانیوە شکاندنی ئێسقانی ئاژەڵەکە، وە فەرمویانە هیچ بەڵگەیەکی صەحیح نیە کە ئەو کارە قەدەغە بکات، وە عادەت وایە کە ئێسقانی ئاژەڵ شکێنراوە کە گۆشتی پێوە بوە، وە ئەوەش بەرژەوەندی تێدایە بۆ خواردنی، وە زیاتر سود لێوەرگرتنی، وە هیچ مەصلەحەتێك نیە کە ئەو کارە مەنع بکات، وە ئەوانەش کە دەڵێن نابێت ئێسقانی ئەو ئاژەڵە بشکێنرێت، دەستیان

---

66 ((تحفة المودود)) لابن القيم، ص(١١١).

گرتەوە بە هەندێك لەو فەرمایشتانەی کە باسمان کرد لە هاوەڵان و تابعین، وە ئەو فەرمودە مورسەلەی ئەبوداودیش، وە دەڵێن بەو شێوەیە جوانتر و چاکترە و ڕێزی خواردنەکەشی تێدایە، وە مادەم لە جیاتی ئەو منداڵە سەر دەبڕرێت باشتر وایە ئێسقانی نەشکێنرێت، وەکو گەشبینیەك بەسەلامەتی و لەش ساغی ئەو منداڵە[٦٧].

**حەوتەم:** هیچ فەرموودەیەکی صەحیح نیەکەبڵێت پێویستە قاچی حەیوانەکە ببرێت بۆ لای مامانەکە و بدرێت بەو.

## ناونانی منداڵ

پێویستەمنداڵی تازە لە دایك بوو ناوێکی لێ بنرێت وەکو گوێڕایەڵی کردن بۆ فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لە چەندەها فەرموودەدا هاتووە، وە سوونەت وایە لە ڕۆژی حەوتەمی لەدایك بوونی دا ناو بنرێت، لەوفەرمودانە:

---

[67] تحفة المودود لابن القيم، ص:١٣١_١٣٢.

١-فەرمودەکەی (عمرو بن شعیب عن ابیه عن جده) وە تێیدا هاتوە: ((أمر بتسمية المولود يوم سابعه.......الحديث)).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کردوە بەوەی کە ناوی منداڵ بنرێت لە ڕۆژی حەوتەمی لەدایك بونیدا.

٢- ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ): کە تێیدا هاتوە: ((... ويسمى فيه ....الحديث)).

واتە: وە تێیدا ناوی منداڵەکە دەنرێت.

٣- وە فەرمودەکەی ئەبو موسا کە دەفەرموێت: ((ولد لي غلام، فأتيت به النبي(ﷺ)، فسماه إبراهيم، وحنكه بتمرة))[68].

واتە: منداڵێکمان بو، منیش بردم بۆلای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش ناوی لێنا ئیبراهیم، وە مەلاشوی شیرین کرد بە خورما.

---

68 اخرجه البخاري(٥٤٦٧)، ومسلم(٢١٤٥).

هەندێك لە زانایان دەفەرموون دروستە ناونانی منداڵ پێش ئەوەی بگاتە ڕۆژی حەوتەمی وە بەڵگەشیان: فەرموودەکەی (أبي موسى الاشعرى )یە: وفيه ((ولدلي غلام فاتيت به النبي (ﷺ) فسماه ابراهيم ....)).

کەواتە دەبێت لەدوای لەدایك بوونی منداڵەکە حەوتەم ڕۆژ ناوبنرێ ئەگەر هاتوو ناویان بۆ نەدۆزیەوە، بەلاًم ئەگەر هاتوو پێشتر ناویان بۆ دانابوو ئەوا دەتوانن هەر کە لەدایك بوو ناوی بنێن، بەڵگەشمان ئەو فەرموودەیەیە کە ((ان النبي دخل ذات يوم علي اهله فقال: **ولد لي الليلة ولد سميته ابراهيم))**[69].

واتە: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە لای یەکێك لە خێزانەکانی و فەرمووی: ئەم شەو خوای گەورە منداڵێکی پێ بەخشیم ناوم نا ئیبراهیم.

---

[69] اخرجه مسلم (٢٣١٥).

## خۆشەویست ترین ناو لەلای خوای گەورە

عن جابر قال: ((ولد لرجل منا غلام فسماه القاسم، فقلنا لا نكنيك أبا القاسم ولا كرامة. فأخبر النبي صلى الله عليه وسلم فقال: **سم ابنك عبدالرحمن**))[70].

واتـە: جابر (رضي الله عنه) دەفـەرموويّت: ((پياويّـك لـە ئيّمـە(واتـە لـە ئەنـصار) منـداڵيان بـوو نـاوى نـا قاسـم، دەفەرموويّت: ئيّمەش پيّمان ووت بانگت ناكەين بە باوكى قاسم، وە ئەم هەواڵە گەيشتەوە بە پيّغەمبەر(ﷺ)، ئەويش فەرمووى بە پياوەكە: منداڵەكەت ناوبنێ عبدالرحمن)).

هەروەها پيغەمبەرى خوا(ﷺ) دەفەرموويّت: ((**أن أحب الأسماء إلى الله عبدالله و عبدالرحمن**))[71].

واتە: خۆشەويسترين ناو لە لاى خواى گـەورە بريتيـە لـە عبدالله و عبدالرحمن.

---

[70] اخرجه البخاري(١٠/٥٧٠-٥٧١ -فتح)، ومسلم(٣٦٣/١٤ - نووى)، وغيرهم.

[71] اخرجه مسلم( ١٤/ ٢١٣٢ – نووى)، و ابو داود(٤٩٢٨)، وغيرهم.

ئیمامی(قرطبي) دەفەرموێت: ((هەموو ناوێك ئەگەر وەكو ئەو دوو ناوەوابێتئەوفەرموودەیەدەیگرێتەوە، بە نموونەی (عبدالرحیم و عبدالملكوعبدالصمد)، هەروەها بۆیە خۆشەویسترین ناوە بەلای خوای گەورەوە، چونكە دەلالەت دەكات لە دوو پلەو ئاست كە پەیوەندی هەیە بە خوای گەورەو مرۆڤەوە، كە بریتیە لە پلەی پەرستن و سیفاتی جوان بەنیسبەت خوای گەورەوە، وە بەندایەتی و زەلیلی و ملكەچی بە نیسبەت مرۆڤەوە، وە هەندێك لە زانایان دەفەرموون: ناوهێنانی ئەو دوو ناوە لە فەرموودەكەدا بەتەنها، لەبەر ئەوەیە كەلە قورئاندا ووشەی(عەبد) نەدراوەتە پاڵ ناوەكانی خوای گەورە جگە لەو دوو ناوە نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيۡهِ لِبَدٗا ﴾ الجن: ١٩.وە دەفەرموێت:﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا ﴾ الفرقان: ٦٣ .

وە هەروەها:﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَ ﴾الإسراء: ١١٠.

## دروست نیە بووترێت ( باوکی قاسم ) ( أبو القاسم )

عن أبي هريرة قال: قال أبو القاسم (ﷺ): (( **سموا باسمي ولا تكتنوا بكنيتي**))[٧٢].

واتە:دروستە ناوتان وەکو ناوی من وابێت، بەلاّم با نازناوەکانتان وەکو نازناوی من نەبێت، واتە دروستە منداڵ ناو بنرێت (محمد)، بەلاّم دروست نیە بە باوکی بوترێت (باوکی قاسم).

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت: ((زانایان بۆچونی جیاوازیان هەیە دەربارەی نازناوی (باوکی قاسم) وە بوون بە سێ مەزهەبەوە.

یەکەم: دروست نیە بەهیچ شێوەیەك بوترێت (باوکی قاسم) بۆ کەسێك کە ناوی محمد بێت یان غەیری محمد، وە ئەوە بۆچونی ئیمامی شافیعیە و هەروەها داودی ظاهیریش.

[72] أخرجه البخاري(١٠/٥٧١-فتح)، ومسلم(١٤/٣٥٩-نووي)، وغيرهم

دووەم: دروستەبۆ هەمووکەس بەڵگەشیانئەوەیە کە قەدەغەکردنی نازناوی (باوکیقاسم) تایبەت بووە بەسەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ).

سێەم: دروستە بۆ کەسێك کە ناوی محمد نەبێت، بەلاّم بۆ محمد ناو دروست نییە.

هەندێك لە زانایان بەوپەڕی ئینکارییەوە دەفەرموون: ((دروست نییە هیچ کەسێك ناوی خۆی بنێت قاسم بۆ ئەوەی بەباوکی نەوترێت (باوکی قاسم)).

ئیمامی(طبري) دەڵێت: ((بۆچونێکی تریش هەیە کە چوارەمە: ئەویش ئەوەیە کە دروست نییە بەهیچ شێوەیەك ناوی منداڵ بنرێت محمد و بانگیش بکرێت (باوکی قاسم).

وەبۆچونێکیترهەیەکەپێنجەمە: ئەویشئەوەیە کە: قەدەغەکردنی ناونان بەمحمدونازناو بە (باوکی قاسم) تایبەت بووە بەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەژیاندا بووە، بەلاّم لە دوای وەفاتی ئەو ئەگەر ئەو کەسە ناوی

محمد بوو یان ئەحمددروست نیەپێی بووترێ (باوکی قاسم) بەڵام ئەگەر ناوی تری هەبوو ئەوا دروستە.

**حافظ ابن حجر** دەفەرموێت: ((ئەو بۆچونەی کۆتای لە هەموویان پەسەندترە و چاکترە، وە مامۆستا ئەبومحەممەد بن ئەبی جەمرە دەفەرموێت: ((باشتر وایە مرۆڤ بۆچوونی یەکەم هەڵبژێرێت کە دەڵێ دروست نیە بوترێ (باوکی قاسم)، بۆ کەسێك ناوی محمد بێت یان نا، چونکە ئەوەیان بۆ مرۆڤ دڵنیا ترە و زیاتر ڕێزو حورمەتی تێدایە بۆ نازناوی پێغەمبەر(ﷺ)، کە بریتیە لە (باوکی قاسم)[٧٣].

## ناوی دڵ تەنگ و ناخۆش

عن ابن المسب عن ابيه ان اباه جاء إلى النبى صلى الله عليه وسلم فقال: ما اسمك؟ قال: حزن، قال: أنت سهل، قال: لا اغير اسما سمانيه أبي، قال ابن المسيب: ما زالت الحزرونة فينا بعد))[٧٤].

---

[73] (فتح الباري، جزء ١٠، ص: ٧٠٣– ٧٠٤).

[74] اخرجه البخاري(٩/ ٦١٩٠ – فتح).

واتـە: ڕۆژێـك بـاپیرەی(سـعید بـن المـسیب)چـوو بـۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) پرسیاری لێ کرد ناوت چیە؟ ئـەویش وتـی: نـاوم (حـزن)ە، واتـە: خـەماوی یـان خـەم، پێغەمبەریش(ﷺ) فـەرمووی: تـۆ نـاوت دڵشادە باپیریشی وتی: من ناوێك ناگۆڕم کە باوکم ئەو ناوەی ناوم، ئیبن موسـەییەب دەفـەرمووێت: بـاپیرم ئـەو نـاوەی پێغەمبەری(ﷺ) هەڵنەبژاردوو نەیویست، هەر بۆیە هەتا لە ناوماندا ما بوو هەمیشە دڵ تـەنگ و خـەماوی بـوو، چـونکە ناوەکەی خەفەتاوی ناخۆش بوو.

## گۆڕینی ناوێك بۆ ناوێکی خۆشتر

عن أبي هريرة أن زينب كان إسمها برّة فقيل: تزكي نفسها فسمّاها رسول الله صلى الله عليه وسلم زينب[75].

ئەبوهورەیرە دەفەرمووێت: زەینەب کە (ژنی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) ناوی (برّە) بوو، خـەڵکی دەیـان ووت پاکانـەبۆ

[75] اخرجه البخاري (٩\٦١٩٢).

خۆیدەكات(واتە بە باش ناوی خۆی دەهێنێ) و لەخۆی ڕازییە، چونكە ئەو ناوە واتای (چاكە خوان) دەگرێتەوە.

ئیمامی(طبري) دەفەرمووێت: دروست نییە ناونان بە ناوێك كە ماناكەی ناخۆش بێت یان خراپ، هەروەها ناوێك كە پاكانەی تێدا بێت، هەروەها ناوێك واتاكەی جوێن دان بێت.

**ئەبوداود** دەفەرمووێت: ((پێغەمبەریخوا(ﷺ) زۆرێك لەو ناوە ناخۆشانەی گۆڕیوە كە گوێی لێبووە، لەوانە:(عاص) سەرپێچی كار، (عتلة) نوێلْ، (غراب) قەلە ڕەش، (شهاب) بلێسەی ئاگر، (حرب) جەنگ، وە چەندەها ناوی تر.

## ناونان بەناوی پێغەمبەرانەوە (عليهم السلام)

عن المغيرة بن شعبة قال: لما قدمت نجران سألوني فقالوا: إنكم تقرؤون (ياأخت هارون) و موسى قبل عيسى بكذا و كذا، فلما قدمت من على رسول الله صلى الله عليه وسلم

سئالته عن ذلك فقال: ((**إنهم كانوا يسمّون بانبياءهم و الصالحين قبلهم**))[٧٦].

(موغیرە) دەفەرمووێت: کاتێك کە چووم بۆ ناوچەی (نەجران) (خەڵکەکەی گاورن) لێیان پرسیم: ئێوە لە قورئانەکەتاندا ئەم ئایەتە دەخوێننەوە: ﴿ يَٰٓأُخْتَ هَٰرُونَ ﴾ مريم: ٢٨.

واتە: ئەی خوشکەکەی هارون (علیه السلام) کە مەبەستی مەریەمی دایکی عیسایە (علیها السلام)، خۆ (موسی) (علیه السلام) کە براکەی ناوی هارونە (علیه السلام) لە پێش عیسادا ژیاون (علیهم السلام) بە ئەوەندەو ئەوەندە ساڵ، ئیتر چۆن بە دایکی عیسا دەڵێن خوشکی هارون. ئنجا (موغیرە) فەرمووی: کاتێك گەشتمە مەدینە و چووم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەو پرسیارەم لێ کرد ئەویش فەرمووی: ((خەڵکانی پێش ئێمە ناوی منداڵەکانیان دەنا بە ناوی پێغەمبەران و پیاو چاکانی پێش خۆیان)).

---

[76] اخرجه مسلم (٢١٣٥/٥ – نووی).

(إبـن بطـال) دەفـەرمووێت: لـەم فەرموودانـەوە ئـەوە وەردەگیرێ کە دروستە ناونانی مندالّ بەناوی پێغەمبەرانەوە (علیهم السلام)، وە سەعیدی کوڕی موسەییەب دەفەرمووێت: ((أحب الأسماء الى الله اسماء الانبيـاء))، واتـە: خۆشەویـست تـرین نـاو لـەلای خـوای گـەورە نـاوی پێغەمبەرانـە(علـیهم السلام).

## کەسێك هاوەڵەکەی بانگ بکات بەناوی خۆیەوە بەلاّم یەك ووشە لە ناوەکەی کەم بکاتەوە بەو مەرجەی نەچێتە بابی

## ناو و ناتۆرەوە

قال ابو حازم: عن ابي هريرة قال قال لي النبي: يا أبا هرّ)).

ئـەبو هـورەیرە ڕەزای خـوای لێبێـت دەفـەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کردم و ووتی: ((يا أبا هر))[77].

---

[77] (صحيح البخاري–كتاب الأدب–باب من دعا صاحبه فنقص من إسمه حرفا).

وعن أبو سلمة بن عبد الرحمن: ((أن عائشة زوج النبي قالت: قال رسول (ﷺ): ((يا عائش هذا جبريل يقرئك السلام))، فقلت: وعليه السلام و رحمة الله، قالت: وهو يرى ما لا نرى)).

عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: جارێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی ووتم: ئەی (عائیش) ئەوە جبریلەو سەلامت لێ دەکات، منیش ووتم: (وعلیە السلام ورحمة الله)، ئەوەی کە تۆ دەیبینی ئێمە نایبینین[78].

## ناخۆشترین ناو لای خوای گەورە

عن أبی هریرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ((**أخنى الأسماء يوم القيامة عندالله رجل تسمّى ملك الأملاك**))[79].

واتە: ناخوشترین ناو لە لای خوای گەورە لە ڕۆژی دوایدا ناوی کەسێکە کە بریتیە لە (ملك الأملاك) واتە پادشا و خاوەنی هەموو دەسەلات و موڵکەکان.

---

[78] صحيح البخاری (٦٢٠١)، ومسلم (٢٤٤٧).

[79] أخرجه البخاری (٩/٦٢٠٥-فتح).

وە هەروەها ووشەی (أخنى) بە (أخنع)یش هاتووە[80]، کە بە واتای زەلیلدێت، بەهەمان شێوە (الحمیدی) کەمامۆستای بوخاریەدەفەرمووێت: ((واتە زەلیل ترین ناو لەلای خوای گەورە ئەو ناوەیە))، عیاضیش دەفەرمووێت: ((ئەو ناوە بچوکترین ناو و ڕیسواترین ناوە لەلای خوای گەورە)).

وە ووشەی ((تسمی)) واتە: ئەو کەسە ئەو ناوە لە خۆی بنێ یاخود پێی ڕازی بێت کە پێی ووترا.

**سوفیان**_ڕەحمەتی خوای لێبێت_دەفەرمووێت: ((بە وێنەی (ملك الأملاك)، ((شاهان شاه)) واتە پادشای پادشاکان، وە بەوە لێکی داوەتەوە.

کەواتە ئاگاداربە ئەو ناوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بە ناشیرین ناوی بردووە و بە خراپە باسیان دەکات بە تەنها ئەو ناوە ناگرێتەوە، بەڵکو هەموو ناوێك کە ئەو واتایەی هەبێت ئیتر بە هەر زوبانێك بێت، وەکو (خالق الخلق)، (أحكم الحاكمين)، (سلطان السلاطين)، (أميرالامراء)، هەروەها

---

[80] (كما وقع عن المستلمي).

ووتـراوە بەهـەمان شـێوە دروسـت نیـە بـوترێ (ڕەحمـان، قـدوس، جبـار)، وە جیـاوازی هەیـە دەربـارەی (حـاکم الحاكمين)دا، وە بەهیچ شێوەیەك ئەو ناوانە دروسـت نیـە بـا ئـەو کەسـە مەبەسـتی پێـی تـەنهاشـوێنێك بێـت وەك: (ملـك الأملاك) مەبەستی وابـێ کـە تـەنها ناوچـەیەکی دیـاری کـراو دەڵێت.

## ئەو ناوانەی دروستە مرۆڤی موسوڵمان لە منداڵ بنێت

عن جابر بن عبد الله قال: ((أراد النبي أن ينهى عن ان يسمى بيعلي و ببركة و بأفلح و بيسار و بنافع و بحو ذلك، ثم رأيته سكت بعد عندها، فلم يقل شيئا، ثم قبض رسول الله (ﷺ) ولم ينه عن ذلك، ثم أراد عمر أن ينهى عن ذلك ثم تركه))[٨١].

جابر دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی کـە قەدەغەمان لێ بکـات لـەوەی کـە منـداڵمان نـاو بنـێین بـەم ناوانە: (یعلی) بڵنـد، (برکة) و (أفلح) ڕزگـار یـان سـەرکەوت،

---

81 (٢١٣٨– شرح صحيح مسلم للنووي).

(یسار) واتە کەسێکی دەوڵەمەند، (نافع) سودمەند، بەڵام پاشان بینیم کە بێدەنگ بوو لە ئاستی ئەو ناوانە و هیچی نەووت هەتا وەفاتی کرد، پاشان (عومەر)_خوا لێی ڕازی بێت_وویستی کە قەدەغەی بکات ناونان بەو ناوانە، بەڵام ئەویش وازی لەو کارە هێناو جێ بەجێی نەکرد.

کەواتە پێویستە موسڵمان ناوێکی خۆش لە منداڵی خۆی بنێت، نەك ناوێك بێت کە بەهۆیەوە خەڵکی گاڵتەی پێ بکات و ناڕەحەتی بکات لەبەر ئەوەی دەگونجێ باوك ناوێکی بەلاوە خۆش بێت بەڵام لە داهاتوودا ئەو منداڵە بەهۆیەوە توشی ناڕەحەتی بێت، وە ئاشکرایە ئازاردانی موسڵمان حەرامە، کەواتە با ناوێکی خۆش کە لەلای خوای گەورە خۆشە هەڵبژێرێت بۆمنداڵی، هەروەها دروست نیە ناونان بە ناوێك کە بەندایەتی لە خۆبگرێت بۆ غەیری خوا وەك (عبد الرسول، عبد الحسین، عبد العلي، عبد الکعبة)، وە ئیبن حەزم کۆڕای زانایانی نقلّ کردووە لەسەر حەرامی ئەو جۆرە ناوانە تەنها (عبدالمطلب) نەبێت لەبەر ئەوەی پێغەمبەری

خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((أنا النبي لا كذب أنا إبن عبدالمطلب)).

بەڵام ئەم فەرموودەیە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە ئەو ناوە دروستە، لەبەر ئەوەی فەرموودەکە تەنها باسی ڕووداو و هەواڵە نەك ئەمر و نەهی، پێغەمبەر (ﷺ) باسی باپیری دەکات، واتە باسی ناوێك دەکات کە ڕۆیشتووە و خاوەنەکەی نەماوەو مردووە، کەواتە بەهیچ شێوەیەك دروست نیە کەس ناوی‌منداڵی بنێت (عبد المطلب)، بەڵکو ئەوەی پێویستە مرۆڤ ناوی ئاسان و سادە و خۆش کە خەڵکی بەرگوێی کەوتووە و واتای زانراوە هەڵبژێرێ بەومەرجەی لە شەرعدا قەدەغە نەکرابێ وەکو ئەو ناوە نامۆیانەی ئەمڕۆ کە زۆر بەیان ناوی خەڵکی بێباوەڕن چونکە حەرامە و خۆشوبهاندنە بەوان.

## ناوی فریشتەکان

زانایان هەندێکیان دەفەرموون: ناونان بەناوی فریشتەکانەوە حەرامە، هەندێکی تر دەفەرموون: باش نیە،

ئەوانی تر دەفەرموون: دروستە بەڵام چاکتر وایە مرۆڤ خۆی لەو ناوانە بپارێزێت وەکو: (جبرائیل، اسرافیل، میکائیل)، بەڵام ئەو ناوانەی کەلەقورئانداهاتووە ئەگەر شەرعەن قەدەغە نەکرابوو دروستە، وە ئەمە بۆچوونی (شێخ محمد بن صالح العثیمین)ە ڕەحمەتی خوای لێبێت.

## هەندێك فەرموودەی (ضعیف و موضوع) كە دەربارەی ناونان هاتووە

١. ((أحب الأسماء الى الله ما عبد وحمد)). لاأصل له – سلسلة الأحاديث الضعيفة (٤١١).

واتە: خۆشەویسترین ناو لای خودا ئەو ناوانەیە کە بەندایتی و سوپاس گوزاری لەخۆی گرتبێت بۆ خودا.

٢. ((أحب الأسماء الى الله ما يعبَّد به)). موضوع- الضعيفة (٤٠٨).

واتە: خۆش ترین ناو لەلای خودا ئەو ناوانەیە کە بەندایەتی تێدایە.

٣. ((حق الولد على الوالـد أن يحـسن اسمـه ويحـسن أدبـه)). موضوع- الضعيفة (١٩٩).

واتە: مافی منداڵ بەسـەر باوکیـەوە ئەوەیـە کـە نـاوێکی خۆشی بۆ دابنێت وە جوان پەروەردەی بکات.

٤. ((من ولد له ثلاثة فلم يسم أحدهم محمدا فقد جهل)). موضوع- الضعيفة (٤٣٧).

واتە: هەرکەسێك سێ منداڵی کوڕی بو وە یەکێکیانی ناو نەنا محمد ئەوە ئەو کەسە نەفامە.

٥. ((من ولد له مولود فسمّاه محمدا تبرُّكا به كان هو و مولوده في الجنة)). موضوع- الضعيفة (١٧١).

واتە: هەرکەسێك منداڵێکی بو وە ناوی نا محمد وەکو پیرۆزیەك بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە خۆشی و منداڵەکەشی دەچنە بەهەشتەوە.

٦. ((يناد مناد يوم القيامة أن من كان اسمه محمد فليقم فليدخل الجنة إكراما لمحمد)). لا أصل له كما قال شيخ محمد عيد العباسي.

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا کەسێك بانگ دەکات و دەڵێت هەر کەسێك ناوی محمدە با هەستێت و بڕواتە ناو بەهەشتەوە وەکو ڕێزێك بۆ محمد (ﷺ).

## خەتەنەکردن

خەتەنەکردن لە صەحیحی سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتووەو باس کراوە، ئەبو هورەیرە خوالێی ڕازی بێت بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە دەفەرمووێت: ((الفطرة خمس: الختان والاستحداد وقص الشارب وتقليم الأظافر ونتف الإبط))[٨٢].

واتە: پێنج ئاکارو خوڕەوشتی ئیسلام هەیە کە هەر کەسێك جێبەجێی بکات ئەوا هەستاوە بە زیندووکردنەوەی شیعاری ئیسلام و بەرز ڕاگرتنی، ئەو پێنج ئاکارەش ئەمانەن: ((خەتەنەکردن، لابردنی مووی دەوری عەورەتی پاش و پێش، کورت کردنەوەی سمێڵ، کورت کردنەوەی نینۆك، لابردنی مووی بن باڵ)).

---

[82] أخرجه البخاري(٦٢٩٧-فتح)، ومسلم(٣/٢٥٧-نووي)، ومالك في ((الموطأ)) (١٩٢٧)، وأبو داود(٤١٩٨)، وغيرهم.

## ئافرەتیش هەمان حوکمی هەیە

دەربارەی خەتەنەکردنی ئافرەتیش چەند فەرموودەیەك هاتووە:

١- قوله (ﷺ) لأم عطية (الخاتنه): (( **احفضي ولا تنهكي فإنه انظر للوجهه واحظى للزوج**))[٨٣].

واتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (ام عطية)ی فەرموو: بە نزمی لەوپارچەگۆشتە ببڕەو هەمووی لێ مەکەرەوە، چونکە مانەوەی بەشێکی، وادەکات ئافرەت ڕوو بدات بە مێردی و ڕوخساری جوانبێت، وە ئەوەش بۆ مێردی چاکترە، وە (ام عطية) رضی الله عنها خەتەنەی مندالآنی دەکرد.

٢-قوله (ﷺ): ((اذا التقى الختانان فقد وجب الغسل))[٨٤].

---

[83] صحيح: اخرجه ابو داود(٥٢٧١)، و الحاكم(٥٢٥/٣)، وابن عدي في ((الكامل)) (١٠٨٣/٣)، و الخطيب في ((تاريخه)) (٢٩١/١٢).

[84] صحيح: أخرجه الترمذي(١٠٨-١٠٩)، وابن ماجه(٦٠٨)، واحمد(١٦١/٦) وغيرهم.

واتە: هەر کاتێک هەردوو شوێنی خەتەنەکراو لە ژن و مێردا گەیشت بەیەك ئەوا پێویستە هەردووکیان خۆیان بشۆن.

کەواتە لەم دوو فەرموودەیەدا باسی شوێنی خەتەنەکراوی ژن و پیاو دەکات کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئافرەتانیش خەتەنە کراون.

وە ئیمامئەحمد دەفەرمووێت: ((ئەم فەرموودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەیکەئافرەتانیشخەتەنەکراون)).

چاكبزانەکە خەتەنەکردنی ئافرەتان هەر لە سەردەمی پێشینەوە هەبووە، وە ئەوان ئەو کارەیان واز لێ نەهێناوە.

بۆ زیاتر دڵنیا بوون بگەڕێرەوە بۆ (سلسلة الأحاديث الصحيحة)، ئیمام ئەلبانی لەو بارەیەوە چەندەها فەرموودەو ئەسەری هێناوە (٣٥٣/٢) کە قسە بۆ کەس ناهێڵێتەوە، تەنها ئەوانە نەبێت کە توشی نەخۆشی شەهوەت بون.

## حوكمی خەتەنەكردن

بۆچوونی تەواو بریتی یە لەوەی كە خەتەنەكردن واجبە، بەڵگەش لەسەری فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) و فەتوای زانایانە.

پێغەمبەر (ﷺ) بە (باپیرەی عثیم بن كلیب)ی فەرموو كاتێ كە هات بۆ لای و موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند: ((**الق عنك شعر الكفر واختن**))[٨٥]. پێیفەرموو : ((ئەو قژەی سەرت بتاشە ئەوە قژی سەردەمی بێ باوەڕییە وە خۆشت خەتەنەبكە)).

كەواتە فەرمانی پێكرد كە خەتەنە بكات وە ئەو فەرمانەش بۆ واجبێتیە.

ئیمام ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێبێت لە ((تمام المنة ص:٦٩)) دەفەرموێت: ((دەربارەی حوكمی خەتەنەكردن،

---

85 حسن: اخرجه ابو داود(٣٥٦)، و عنه البيهقي(١٧٢/١)، واحمد (٤١٥/٣)، يقول الإمام الألباني إمام المحدثين_رغم انف الأغرار و الأحداث_رحمه الله هذا الحديث حسن، كما بينه في ((الإرواء))(٧٩)، وصحيح ابي داود رقم (٣٨٣).

بۆ چوونی ڕاست لە لای ئێمە ئەوەیە کە واجبە، وە ئەوەش بۆچوونی زۆربەی زانایانە وەکو (مالیك و شافعی و ئەحمەد و ابن القیم)، وە (ابن القیم) دەربارەی وا جبێتی خەتەنە پازدە شێوەی باس کردووە، بەڵام ئێمە تەنها دوو دانەی لێ باس دەکەین:

یەکەم: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ﴾النحل:١٢٣.

واتە: شوێن ئاین و پەیڕەوی ئیبراهیم بکەون (علیە السلام)، وە ئاشکرایە کە خەتەنەکردن یەکێکە لە شیعارەکانی ئاینی پێغەمبەر ئیبراهیم (علیە السلام)، هەروەك (ابوهریرة) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە دەفەرموێت: ((**اختتن ابراهیم بعدما اتت علیە ثمانون سنة**))[86].

---

[86] اخرجه البخاري(٦٢٩٨ – فتح)، و مسلم(٢٣٧٠)، والبيهقي(٨/ ٣٢٥)، و احمد(٢/٣٢٢– ٤١٨) واللفظ له.

واتە: پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) خۆی خەتەنە کرد لە دوای ئەوەی کە تەمەنی گەیشتبووە هەشتا ساڵی.

دووەم: خەتەنە کردن یەکێکە لە دیارترین شیعارەکانی ئاینی ئیسلام کە بە هۆیەوە موسوڵمانان لە گاور جیا دەبێتەوە.

هەروەها حوکمەکەی گشتیە بۆ پیاوان و ئافرەتان، بەڵام دەگونجێ هەندێك ئافرەت هەبێت کە ئەو پارچە گۆشتەیان نەبێت، کەواتە لەو حاڵەتەدا ئەو فەرمانە ئەوان ناگرێتەوە.

## کاتی خەتەنەکردن

پێشتر باسمان کرد کە حوکمی خەتەنەکردن واجبە، کەواتە هەر شتێك فەرمانی پێ کرابوو پێویستە زۆر زوو جێبەجێ بکرێت، لەگەڵ ئەوەی کە چەند فەرموودەیەك لە بارەی کاتی خەتەنە کردنەوە هاتووەو دیاری کردووە بەوەی کە لە ڕۆژی حەوتەمدا بێت، بەڵام هیچ کام لەو فەرموودانە

بێ قسەو باس نیەو سەنەدی فەرموودەکان قسەی زۆر لەسەرە ئەمەش ئەو سێ فەرموودەیەیە:

**یەکەم:** عن جابر بن عبد الله ان رسول الله (ﷺ): ((عق عن الحسن و الحسين وختنهما لسبعة ايام))[٨٧].

واتە پێغەمبەریخوا(ﷺ) گوێزەبانەی بۆ حەسەن و حوسێن کرد و خەتەنەی کردن لە حەوتەم ڕۆژی لە دایك بوونیاندا.

**دووەم:** عن ابن عباس قال: ((سبعة من السنة في الصبي يوم السابع ... ويختن ... )).

واتە: (حەوت شت سوننەتە جێبەجێ کردنی لە حەوتەم ڕۆژدا بۆ منداڵ یەکێکیان خەتەنە کردنە ... ).

**سێیەم:** عن ابي جعفر قال: ((كانت فاطمة تعق عن ولدها يوم السابع و تختنه و تحلق شعر رأسه و تصدق بوزنه ورقا))[٨٨].

---

[87] رواه ابن عدى في ((الكامل)) (٣\١٠٧٥)، و الطبراني في ((الصغير)) (١٢٢/٢)، و البيهقي في ((الكبرى)) (٣٢٤/٨) وفي ((الشعب)) (٣٩٤/٦).

واتــه: (فاطمة)ــخــوای لێـیڕازی بێـت_گوێزەبانـەی بـۆ منداڵی دەکـرد لـە حەوتـەم ڕۆژی دا و خەتەنەشـی دەکـرد و سەری دەتاشی و بەقەد وەزنی قژەکەی زیوی دەکرد بەخێر.

کەواتـە گومـانی تێـدا نیـە زوو ئەنجامـدانی خەتەنـە بـۆ منداڵ زۆر باشترە لەبەر ئەوەی ئازاری کەمترە، بەپێچەوانەی درەنـگ خـستنی چـونکە ئـەو کاتـە ئازارەکـەی زۆرتــرە و ناخۆشـە، پێغەمبـەری خـواش (ﷺ) ئەگـەر هەڵبـژاردن لـە دەستیدا بووایە بۆ جێبەجێ کردنی کارێك، کامـەیان ئاسـانتر بووایە ئـەوەیانی هەڵدەبـژارد مـادەم تـاوانی تێـدا نەبووایـە، خەتەنە کردنیشدەرکەوتنیعـەورەتیمرۆڤـیتێدایـە، کەواتـە دەرکــەوتنی عــەورەتی بــەمنــداڵی زۆر باشــترە لــەوەی دەرکەوێت بە گەورەی.

---

[88] اخرجه ابن ابي شيبة في ((المصنف)) (٨/ ٥٣).

# بەشی چوارەم
# پەروەردەو فێر کردنی منداڵ

بەپێویستم زانی وەکو زیادە سود گەیاندن بە خوێنەری ئازیز ئەم بەشەش بخەمە پاڵ بەشەکانی تری ئە کتێبە بەهۆی گرنگی باسەکەو پێویستی موسوڵمانان بۆی، چونکە گومانی تێدا نیە خراپترین هۆکار بۆ خراپکردنی کۆمەڵگە بریتیە لە خراپ پەروەردە بوونی ڕۆڵەکانی ئەو کۆمەڵگەیە، وە لەبەر ئەو هۆیە ئاینی ئیسلام بەو پەڕی چاودێریەوە دەڕوانێتە لایەنی پەروەردەوفێرکردنیمنداڵ چونکە بەهۆیەوە دەتوانین کۆمەڵگەیەکی موسوڵمانی بەختەوەر پێك بهێنین، هەروەها خوای گەورە فەرمانی کردووە بەپەروەردە و فێرکردنی مندالآن و دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ﴾ التحريم:٦.

خوایگەورە دەفەرموێت: ئەی ئەوکەسانەی کە خوای گەورە مننەتی خۆی ڕشتووە بەسەرتاندا و ئیمانی پێ بەخشیون، ئێوەش هەستن بەجێبەجێکردنی ئەرك و

مافەکانی ئەو ئیمانە بەوەی خۆتان و ماڵ و منداڵتان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخ، پاراستنی خودی مرۆڤ بەوە دەبێت کە خۆت بپارێزیت لە تورەی خوای گەورە، ئەویش بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و خۆپاراستن لەو شتانەی کە قەدەغەی کردووە، هەروەها تەوبەکردن لەو کارە خراپانەی کە خوای گەورە پێی ناخۆشە و بەهۆیەوە مرۆڤ بەرەو ئاگری دۆزەخ دەچێت، هەروەها پاراستنی ماڵ و منداڵ بەوە دەبێت بە جوانی پەروەردەیان بکەین و فێری کاری جوانیان بکەین و پاڵنەریان بین بۆ گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی خوا.

کەواتە پارێزراوی مرۆڤ لەوەدایە کە هەڵبسێت بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای گەورە لە خودی خۆی و ئەو کەسانەش کە لە ژێر سەرپەرشتی ئەودان، وە خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە بەوەی کە سووتەمەنی ئاگری دۆزەخ مرۆڤەکانە لەگەڵ بەرد.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((**كل مولود يولد على الفطرة فابواه يهودانه أو ينصرانه أو يمجسانه**))[٨٩].

واتە: هەموو منداڵێك كە لەدایكدەبێت لەسەر پاكێتی و ئیسلام لەدایك دەبێت، بەڵام كە وورده وورده گەورە بوو دایك و باوكی دەیگۆڕن و لەسەر ئەو پاكێتیە لای دەبەن، یان دەیكەن بەگاور، یاخود جولەكە، یان ئاگر پەرست.

وعن معاذ بن جبل ان النبي (ﷺ) قال: ((**انفق على عيالك من طولك ولا ترفع عنهم عصاك**))[٩٠].

واتە: ئەوەندەی توانات هەیە نەفەقەو خەرجی ماڵت بكێشەو خۆش گوزەرانیان بكەو بێئاگامەبە لێیان و ئاگاداریان بكەرەوە لەو شتە خراپانەی كە دەبێت خۆیانی لێ بپارێزن وەهەمیشەچاودێرییان بكەو بیان ترسێنە لە سەرپێچی كردنی خوای گەورە.

---

[89] أخرجه البخاری(٤٧٧٥– ٦٥٩٩ فتح)، و مسلم (٢٦٥٨)، و مالك (٩٩٥/١)، و ابو داود (٤٧١٤)، و الترمذی (٢١٣٨)، و غيرهم.

[90] رواه احمد .

کەواتە مندالّ ئاسودەیی مرۆڤە لە ژیانی دونیادا، خۆشی و شادی تەمەنیەتی، ژیان بەوانەوە خۆشترە، هەربەهۆی مندالّەوە مرۆڤ تووشی ڕزق و ڕۆزی خوایی دەبێت و ڕەحمەت و بەزەی دادەبەزێت بەسەریدا، بەلاّم هەموو ئەمانەی کە باسم کرد کاتێك ڕوودەدات کە پەروەردەی مندالّ پەروەردەیەکی چاك بوو، وە لەسەر چاکە خوازی و ڕەوشتی بەرز گەورە بوون.

## خوڕەوشتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ مندالّدا

عن عمرو بن أبي سلمة قال: كنت غلاما في حجر رسول الله و كانت يدى تطيش في الصحفة فقال لي رسول الله **((ياغلام سم الله تعالى و كل بيمينك، و كل مما يليك))**[91].

شێخ(عثيمين)_ڕەحمەتی خوای لێبێت_لەشەرحی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرمووێت: ((گومانی تێدا نیە کە خواردن و خواردنەوە بە دەستی ڕاست واجبە، وە خواردن و خواردنەوە بەدەستی چەپ حەرامە، هەرکەسێ بەدەستی چەپ بخوات

---

[91] متفق عليه: (٥٣٧٦ – صحيح البخارى)،(٢٠٢٢– صحيح المسلم).

یان بخواتەوە تاوان بارەو سەرپێچیکارە، سەرپێچیخواو پێغەمبەرەکەی کردەووە(ﷺ)، وەخۆی شوبهاندووە بە شەیتان و دۆستانی شەیتان لەبێ باوەڕان، کەواتە واجبە دەستیڕاست بەکاربهێنرێت بۆنان خواردنیاخود خواردنەوەی شتی بەسوود، مەگەر ئەوەی کە نەتوانێ وەکو شەلەلی دەست (فاتقوا الله ما استطعتم)، پاشان (عەمر) فەرموودەکەمان بۆ باس دەکات و دەفەرمووێت: منداڵ بووم، ڕۆژێك لە کۆشی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دانیشتبووم دەستم بەملاو لادا دەبرد لەسەر سفرەی نان خواردنەکە، دەستم بۆ ئەم شت دەبرد و بۆ ئەو شت، منداڵ بووم نەمدەزانی، لە ڕاست و چەپ و بەردەم و ناوەڕاستی سفرەکە شتم هەڵدەگرت و دەمبرد بۆ دەمم، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((یا غلام سم الله)) واتە ڕۆڵە بڵێ بەناوی خوا لەکاتی دەست کردن بە نان خواردن، ((وکل بیمینك و کل مما یلیك))، وە بە دەستی ڕاست نان بخۆ، وە لەبەردەم خۆتەوە بخۆ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ ئاکاری جوانی

فێری ئەم منداڵە کرد کە هەرسێکیان ئاکاری کەسێکە کە شوێن کەوتەی سوننەت بێت، (بسم الله) ووتنی بەناوی خوا لە کاتی نان خواردن کە واجبە ووتنی، (کل بیمینك) بە دەستی ڕاست نانەکەت بخۆ کە ئەویش هەر واجبە، (وکل مما یلیك) لە بەردەمی خۆتەوە نان بخۆ، کە ئەمەش ڕێز و ئەدەبێکە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لەگەڵتن لەسەر سفرەی نان خواردن، چونکە ناشیرینە و کارێکی باش نیە لەبەردەم ئەوەی پەناتەوە شت هەڵ بگریت و شت بخۆیت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ ئاکاری جوانی فێری ئەم منداڵە کرد لەسەر سفرە و لەیەك کاتدا، کە ئەمەش یەکێکە لەو کارە پڕ بەرەکەت و پیرۆزانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە خەڵکی فێری زانست دەکات لە هەموو بۆنەیەکدا.

بەهەمان شێوەدەبێت قوتابی‌زانستی‌شەرعی‌وغەیری ئەوانیش، هەرکەسێك سوننەتێك دەزانێت، دەبێت ڕوونی بکاتەوە بۆ خەڵکی لەهەر بۆنەیەکدا بێت، با نەڵێت ئاخر من ئەهلی عیلم نیم (مەلا نیم)، ڕاستە تۆ زانا نیت بەڵام خۆ

هەندێك كاری جوان و چاك دەزانیت كـە لـە ئیـسلامدا هەیـە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((**بلغوا عنی ولو آیة**))[92]

واتە: چی دەزانیت لە قسەو گوتار و كرداری من بەخەڵكی ڕابگەیەنە، ئەگەر ئەوەی كەدەیزانیت ئایەتێك بێت لەقورئان، هەركاتێك لەهەرشوێنێك توانیت مەوەستەو ئەوەی دەیزانیت لە سوننەت بڵاوی بكەرەوە لەناو خەڵكیدا، باخێر و پاداشت و چاكەت دەست بكەوێت، وە خێر و چاكەی ئەوانەیش كە بەگوێت دەكەن و ئیش بەو ئامۆژگاریە چاكانەت دەكەن هەتا ڕۆژی دووای.

عن ابو قتادة ((ان النبي كان يصلي وهو حامل أمامة بنت إبنته زينب فاذا ركع وضعها و إذا قام حملها))[93]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی دەكرد وە ئومامـەی كچی زەینەبی كچی (واتە كچەزاكەی) لە باوەشـیدا بـوو، كـە

---

[92] البخاري(٣٤٦١).

[93] صحيح البخاري (٥١٦)، و صحيح مسلم (٥٤٣).

دەچـووەرکـوع و سـوجدە دایـدەنا کـە هەڵدەسـایەوە دەیکردەوە باوەشی.

قال شداد بن الهاد عن ابيه: خرج علينا رسول الله (ﷺ) وهو حامل الحسن و الحسين فوضعه، ثم كبر للصلاة فصلى فسجد بين ظهراني صلاته سجدة أطالها فلما قضى الصلاة، قال: ((**ان ابني ارتحلني فكرهت ان اعجله**))[٩٤].

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژێك هاتە ناو مزگەوتـەوە وە حەسەن و حوسێن لە باوەشیدا بوون، وەختی نوێژ هات و هەردووکیانی لە سـەر زەوی دانـا و (الله أکبر)ی چـوونە نـاو نوێژی خوێند و دەستی کرد بە خوێنـدنی نوێژەکـەی، وە لـە ڕکاتێك لە ڕکاتەکاندا کە سـوجدەی بـرد زۆر درەنـگ سـەری بەرز کردەوە لـە سـوجدە، وە پـاش تـەواو بـوونی نوێژەکـە فەرمووی: ((ئەم کوڕە خۆشەویستەم چووبووە سـەر پـشتم،

---

[94] صحيح: أخرجه احمد في ((مسنده)) (٤٩٣/٣)، والنسائي في ((المجتبي)) (١١٤١)، و ابن حزم في ((المحلى)) (٩٠/٣)، و ابن ابي عاصم في ((الآحادى و المثاني)) (٩٣٤).

منیش حەزم نەکرد کە پەلەی لێ بکەم بۆیە هەڵنەسامەوە هەتا خۆی دانەبەزی لە سەر پشتم)).

## پەروەردە و فێرکردنی منداڵ لە سەرەتای تەمەنیەوە

ئاینی ئیسلام گرنگیەکی زۆری داوە بە پەروەردە و فێرکردنی منداڵ بە مەبەستی چەسپاندنی بیروباوەڕ لە دڵ و دەروونیاندا، ئەمەش دەردەکەوێ هەر لە یەکەم ساتەکانی ژیانی هاوسەری، ئەویش بە هەڵبژاردنی ئافرەتێکی چاك و بەڕەوشت، وەپیاوێکیخاوەن دین ورەوشت، هەروەها ڕاهێنانی منداڵ لەسەر فێربوونی ئەدەبی خەوتن، نان خواردن، لەسەرخۆیی، پاراستنی زوبان، ڕێزی گەورە، سلاو کردن، بەلام بە شێوەیەکی لەسەرخۆ و ووردە ووردە، بە پێی تەمەن و کاتەکان، هەروەها سوننەتی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) فێرکردنی منداڵ کاروبای ئاینەکەی هەر لە دەست نوویژ و پاك وخاوێنی ونوێژ و ڕۆژوو و پاڕاناوە و خوڕەوشتی جوان، هەروەها ووتنی ئەو دۆعایەی کە لەسوونەتدا هاتووە لە کاتی چونە لای خێزان کە بریتیە لە: ((بسم الله، اللهم

جنبنا الشيطان وجنب الشيطان ما رزقتنا ))، فقال: ((**فإن رزقه الله بولد لم يضره الشيطان**)).

واتە: بەناوی خوا، خوایەگیان شەیتان دوورخەرەوە لێمان، وە ئەو منداڵەش کە پێمان دەبەخشی بە دووری بگرە لە شەڕی شەیتان، ئنجا فەرمووی: ئەگەر خوای گەورە منداڵیان پێ ببەخشێ ئەوا هەرگیز شەیتان ناتوانێت ئازاری پێ بگەیەنێ.

هەروەها جێبەجێ کردنی گوێزەبانە و هەڵبژاردنی ناوی خۆش و دادپەروەری لە نێوان منداڵان و فێرکردنی ئەو شتانەی کە سوودی هەیە بۆیان لە دونیا و دواڕۆژدا، هەروەها پاڕانەوە لە خوای گەورە و داوای دوعای خێر بۆیان بەو جۆرەی کە لە قورئاندا هاتووە: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾ الفرقان: ٧٤، وە ئەو فەرمایشتەی دەربارەی

زەکەریا (سەلامی خوای لبێت): ﴿ قَالَ رَبِّ هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةًۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾ ﴾ آل عمران: ٣٨ .

## تێکەڵ بوون بە دوونیای منداڵ

هەندێك کەس وا هەست دەکەن ئەگەر لەگەڵ منداڵەکانیان ڕووخۆش و کراوە و هاوڕێ بن، دەبێتە هۆی ئەوەی کە لاواز وبێ ڕێز بێت لە لایان و شوێن و ئاستی باوکایەتی لەدەست دەدات، بەڵام ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە هەڵەیە و دوورە لە ڕاستی یەوە، چونە تێکەڵ بوون بە دونیای منداڵ و هەڵس و کەوت کردن لە گەڵیان خورەوشتێکی بەرز و جوانە و ئەو جۆرە هەڵس و کەوتە هەمان شتە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش چەندەها سەدە بانگەوازی بۆ کردووەبە ووتەو و کردار، ئەوەتا بە منداڵەکانی بنەماڵەی (عباس)ی مامی دەفەرموو: (( **من سبق إلي فله كذا وكذا فيستبقون إليه فيقعون على ظهره و صدره فيقبلهم**))[٩٥]

---

[95] رواه أحمد و قال الحافظ في التهذيب (٨\٤٢١): وهو مرسل جيد الاسناد

واتە: هەر یەكێكتان ڕابكات بۆلای من و زووتر بگاتە لای من ئەوا منیش ئەوە و ئەوەی دەدەمێ، ئەوانیش بەرەو ڕووی ڕایان دەكرد و دەكەوتن بەسەرپشتی وسنگی دا، پێغەمبەریش(ﷺ) هەڵی دەگرتنەوە و ماچی دەكردن.

## هەست كردنی منداڵ بە هەست و سۆزی دایك و باوكایەتی

پێویستە دایك و باوك وا لە منداڵەكانیان بكەن كە هەست بكەن بە سۆز و میهرەبانیان، چونكە سۆز و بەزەی یەكێكە لە ڕەوشتە بەرز و پیرۆزەكانی ئاینی ئیسلام، وە یەكێكە لەو ئاكارە جوان و دیارانەی كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ناسراوە، هەروەك ئەنەس بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((ما رأيت أحدا أرحم بالعيال من رسول الله صلى الله عليه وسلم، قال: كان إبراهيم مسترضعا له في عوالي المدينة فكان ينطلق ونحن معه فيدخل البيت فيأخذه فيقبله ثم يرجع ))[96].

واتە: كەسم نەدیوە هێندەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڕەحم و سۆزبێت بەرامبەر بەماڵ و منداڵی، ئینجا

[96] رواه مسلم.

فەرمووی: ئیبراهیمی کوڕی لەدەوروبەری مەدینە بوو لە ماڵێك بەخێویان دەکرد و شیریان دەدایە، بەردەوام پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەچوو بۆ لای وە ئێمەش لە گەڵی دەچووین کە دەڕۆیشت بۆلای، کاتێ کە دەچووە ناو ماڵەکەوە ئیبراهیمی دەکردە باوەش و ماچی دەکرد و پاشان دەگەڕایەوە بۆ مەدینە.

هەروەها سۆزو میهرەبانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنها بۆ ماڵ و منداڵی خۆی نەبوو بەڵکو هەموو کەسانی خاوەن باوەڕی گرتبوویەوەبە گشتی و لە ناویاندا منداڵان بە تایبەتی، ئەنەس دەفەرمووێت: ((كان كلما مر بصبيان هش لهم و سلم عليهم))[97].

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرکاتێك بەلای منداڵاندا تێپەڕ ببوایە بەو پەڕی دڵخۆشی و دەم بەپێکەنینەوە سلاوی لێ دەکردن، هەروەها ئەبوهورەیرە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((أن النبي قبل الحسن بن علي فقال الأقرع بن

---

[97] متفق عليه.

حابس إن لي عشرة من الولد ما قبلت منهم أحدا، فقال رسول الله (ﷺ): ((من لا يرحم لايرحم))[٩٨].

واته: جارێك پێغەمبەر (ﷺ) ماچی حەسەنی كوڕی ئیمامی عەلی كرد، كابرایەكیش لەوێدا بوو ناوی (ئەقرەع) بوو وتی: مندە منداڵم هەیە هەتا ئێستا كەسیانم ماچ نەكردووە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((هەركەسێك بە ڕەحم و سۆز و میهرەبان نەبێت خواش ڕەحمی پێ ناكات)).

## خزمەت كردن و بەخێو كردنیان بە دەست و دڵێكی فراوانە

ئوم‌سەلەمە پرسیاری‌كرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی ئەوەی كە ئەگەر پارە و پولی خۆی خەرج بكات بۆ منداڵەكانی ئایا پاداشی دەست دەكەوێت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((نعم لك أجر ما أنفقت عليهم))[٩٩].

واتە: بەڵێ چەندەپارەیان بۆخەرج بكەیت‌ئەجر و پاداشتت بۆ دەنوسرێ، بەڵكو ئاینی ئیسلام خەرجی ماڵ و

---

[98] متفق عليه.

[99] متفق عليه.

منداڵی بە باشترین و چاکترین ڕێگاکانیمالّ خەرج کردن دادەنێت و پاداشتێکی گەورەی بۆ داناوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: ((دينار أنفقته في سبيل الله و دينار أنفقته في رقبة و دينار تصدقت على مسكين و دينار أنفقته على أهلك، أعظمها أجرا الذي أنفقته على أهلك))[١٠٠].

واتە: دینارێك لە ڕێی خوادا و بۆ جیهادبەخشیبێتت، وە دینارێك بەخشیبێتت بۆ ئازادکردنی بەندەیەکی موسوڵمان لە کۆیلایەتی، وە دینارێك کردبێتت بە خێر و دینارێك کە بۆ ماڵ و منداڵی خۆت خەرجت کردووە، پاداشتی کامەیان لە هەموویان زیاترە، بێ گومان ئەوەیان پاداشتی زیاترە کە بۆ ماڵ و منداڵی خۆت خەرجت کردووە.

موسوڵمان کاتێك گوێ بیستی ئەم فەرموودانە دەبێت، پێویستە بە دەست و دڵی فراوانەوە هەستێت بە جێ بەجێ کردنیپێویستی ماڵ ومنداڵی، بەتایبەت کە دەزانێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڕەشە دەکات لەو پیاوانەی هەست

[100] رواه مسلم.

بـە لێپرسـراوی ناکـەن و گـوێ نـادەنێ، بـەوەی کـە سـزای سـەخت و تـاوانی گـەورە لـە ئەسـتۆیانە وەك دەفـەرمووێت:

((**كفى بالمرء إثماً أن يضيع من يقوت**))[١٠١].

واتە: بەسە بۆ مرۆڤ کـە ئەوەنـدە تـاوان باربێـت بـەهۆی هەست نەکردنی بە لێپرسراوی، ببێتـە هـۆی فەوتانـدنی ئـەو ماڵ ومنداڵەی کە ئەم بەخێویان دەکات، واتە ئەگەر مرۆڤ بـە باشی حەقی ماڵ ومنداڵی نـەدات لـە ڕووی خـواردن و جـل و بەرگ و پێویستی تر، تاوانبارە و بەڵکو ئەو تاوانە بەسـە بـۆ ئەوەی خوای گەورە سزای سەختی بدات.

## جیاوازی نەکردن لە نێوان کوڕ و کچدا لە ڕووی سۆز و خۆشەویستی و پێداویستی ڕۆژانە

هەندێك کەس لەوانەیە ناڕەحەت و بێ تاقەت بن بـەهۆی ئەوەی کە خـوای گـەورە کـچی پـێ بەخـشیون و تەمـەننا و ئاواتی ئەوە دەخوازن کە خوای گەورە بـە تـەنها کـوڕی پـێ بەخشیبانایە، بەڵام ئەم جۆرەکەسانە بێ ئاگـان ونـازانن کـە

[101] رواه مسلم و ابوداود و غيرهما.

خوا چ پاداشتێك و ڕێزێكی بەخشیوە بەو دایك و باوكەی كە كچی پێ بەخشیون بەهۆی ئارامگرتنیان لەسەر پەروەردە و فێركردنیان، ئەگەر بزانن چ پاداشتێكی زۆرچاوەڕێی ئەودایك و باوكە میهرەبانە دەكات، ئەوا هەرگیز ئەو ئاواتەیان نەدەخواست و بەڵكو ئۆخەی ئەوەیان دەخواست كە لە شوێنی ئەو دایك و باوكانە بن كە كچیان هەیە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموویت: ((من كان له ثلاث بنات فصبر عليهن و أطعمهن و سقاهن و كساهن من جدته، كن له حجابا من النار يوم القيامة))[١٠٢].

واتە: هەركەسێك سێ كچی هەبێت ئارام بگرێت لە سەریان، وە خەرجیان بكێشێت لە ڕووی خواردن و جل و بەرگ، ئەوا لە ڕۆژی دوایدا دەبنە دیوار و بەربەستێك لەنێوان ئەو دایك وباوكە وئاگری دۆزەخدا، واتە بەهۆی ئەو سێ كچەیەوە خوای گەورە نایخاتە ئاگری دۆزەخ.

---

[102] صحيح: أخرجه مسلم (١٦٣١)، و أبوداود (٢٨٨٠)، و النسائي في ((المجتبى)) (٦\٢٥١)، و ((الكبرى)) (٤\١٠٩)، و الترمذي (١٣٧٦) و غيرهم.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ((من كان له ثلاث بنات يؤيهن و يكفهين و يرحمهن فقد وجبت له الجنة، فقال رجل من بعض القوم و اثنين يارسول الله (ﷺ)؟ قال: ((و اثنين)).

واتە: هەرکەسێك سێ کچی هەبێت خزمەتیان بکات و شوێنی حەوانە و پێداویستی ڕۆژانەیان بۆ دابین بکات و بەسۆز و میهرەبان بێت لە گەڵیاندا، ئەوا بە ڕاستی بەهەشت جێگەی ئەو کەسەیە، پیاوێك لە ناو خەڵکەکەدا ووتی: ئەی ئەگەر دوو کچ بێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ ئەویش فەرمووی: ئەگەر دوو کچیش بێت.

هەروەها ئاینی ئیسلام کە ئاینی ژیانە و چارەسەرە بۆ هەموو ئەو کێشانەی کە ڕووبەڕووی مرۆڤەکان دەبێتەوە لە ڕۆژگاردا، جەخت دەکاتەوە لەسەر نەرم ونیانی نواندن لەگەڵ ئافرەتدا، بۆ نمونە دەگونجێ ئافرەت لە دوای شوکردنی تووشی جیابوونەوە ببێت لەگەڵ هاوسەرەکەی دا و ناچار بگەڕێتەوە بۆ ماڵی باوکی، لەوانەشە باوکی زۆر کەم

دەرامەت بێت و هەژاربێت، لەم کاتەدا ئاینی ئیسلام هەڵدەسێت بەسارپێژکردنی برینیئەو باوکەهەژارە بەوەی پاداشتێکی زۆر گەورەی دەست دەکەوێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (سراقة بن جعشم)ی فەرموو: ((ألا أدلك على أعظم الصدقة أو من أعظم الصدقة؟)) قال: بلى يا رسول الله، قال: ((إبنتك مردودة إليك ليس لها كاسب غيرك))[103].

واتە: ناتەوێت پێت بڵێم کام چاکە و خێرکردنە لە هەموو چاکە وخێرکردنێك گەورەترە؟ منیش ووتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرمووی: گەورەترین چاکە و خێر ئەوەیە کە خەرجی ئەو کچەت بکێشی کە گەڕاوەتەوە بۆلات و لە مێردەکەی جیابووەتەوە و کەس نیە یارمەتی بدات تۆ نەبێ.

---

[103] رواه البخاري في ((الأدب المفرد)).

## چاو کراوەی و شارەزای بەو شتانەی کە دەبێتە هۆی بنیات نان و ئاراستە کردنی منداڵ

دایـك و بـاوکی موسـوڵمانی شـارەزا، چـاوکراوەیە و دەزانێـت کـە منداڵـەکانی چـیدەخوێننـەوە وچـیدەنوسـنو هـەروەها شـارەزان دەربـارەیئارەزووەکانیـان، هـەروەها دەزانن کە منداڵەکانیان هاورێیەتی کێ دەکەن و ڕوودەکەنـە چ شوێنێك لە کاتی دەست بەتاڵی دا، کەواتە پێویـستە دایـك و باوك هـەموو ئـەم شـتانە بـزانندەربـارەی منداڵـەکانیانبـە شێوەیەك کە منداڵەکان هەست نەکەن، هەربۆیە ئەگەر هاتوو هەسـتیان کـرد کـە تووشـی لادان بـوون و شـتی خـراپ دەخوێننـەوە و ئـارەزووی خراپیـان هەیـە، یـاخود هـاورێی خراپیان هەیـە، وە تووشـی ئاکـار و پیـشەی ناشـرین و ئـەو جۆرە یاریانە بون کە باش نین وە یان حـەرامن، وە زۆربـەی کاتەکانیان بە فیڕۆ دەدات، ئەوا لەو حاڵەتەدا بەو پەڕی نەرم و نیانی و حیکمـەت و لێ زانینـەوە دەیـان گێڕنـەوە بـۆسـەر ڕێگای ڕاست و لەو پێناوەشدا باشترین شێواز بەکاردەهێنن.

## جیاوازی نەکردن لە نێوان منداڵەکانی دا

یەکێك لەو شێوازە چاکانی کە بەهۆیەوە منداڵ فێری خوڕەوشتی جوان و ئاکاری باش دەبێت ئەوەیە کە باوك و دایك جیاوازی نەکەن لە نێوانیادا، وە هیچ کامیان پێش نەخەن بەسەر ئەوانی تردا، ئەگەر ئەو منداڵە لەسەر ئەو جۆرە شێوازە گەورەبێت وە دووربێت لە هەست کردن بەکەم تەرخەمی لە بەرامبەری، ئەوا هەرگیز تووشی ڕق لێ بوونەوە لە خوشك و براکانی تری نابێت، (نوعمانی کوڕی بەشیر) بۆمان دەگێڕێتەوە کە باوکی چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) وە پێی ووت: ((إنی نحلت إبني هذا غلاما كان لي فقال رسول الله (ﷺ): ((أكل ولدك نحلته مثل هذا؟ فقال: لا، فقال رسول الله (ﷺ): ((فارجعه))، و في رواية فقال رسول الله (ﷺ): ((أفعلت هذا بولدك كلهم؟))، قال: لا، قال: ((اتقوا الله واعدلوا في أولادكم))، فرجع أبي فرد تلك الصدقة، و في رواية: فقال رسول الله (ﷺ): (( يا بشر ألك ولد سوى هذا؟))، قال: نعم، قال: ((أكلهم وهبت له مثل هذا؟))، قال:

لا، قال: ((فلا تشهدني إذا، فإني لا أشهد على جور))، ثم قال: ((أيسرك أن يكونو لك في البر سواء؟))، قال: بلى، قال: ((فلا إذا))[١٠٤].

واتە: ئەم کوڕەم بەندەیەکم پێ بەخشیوە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((هەموو منداڵەکانت بەهەمانشێوەی ئەم کوڕەت بەندەت پێ بەخشیون))، ئەویش ووتی: نەخێر، پێغەمبەریخواش (ﷺ) فەرمووی: ((دە مادەم وایە بیگێڕەوە بۆ خۆت و مەیدەرێ))، لەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئایا منداڵەکانی تریشت هەمان شتت داوە پێیان؟))، باوکیشم ووتی: نەخێر، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لەخوا بترسن ودادپەروەربن لەنێوان منداڵەکانتان))، پاشان باوکم گەڕایەوە و ئەو خێرەی کە دایبومێ لێی وەرگرتمەوە، لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەی بیشر ئایا منداڵی ترت هەیە بێجگە لەم؟))، ووتم: بەڵێ، فەرمووی: ((بە هەموویان هەمان

---

104 رواه الشيخان.

شت پێ بەخشیون؟))، ووتم: نەخێر، ئنجا فەرمووی: ((دە کەواتە من مەکە بە شایەت بەسەر ئەم کارەتەوە چونکە من شایەتی بۆ زوڵم و ستەم نایەم))، پاشان فەرمووی: ((حەزدەکەیت هەموویان وەکو یەك وابن بۆت لە چاکە و خێردا)) ووتم: بەڵێ، فەرمووی: ((کەواتە نەخێر مەیدەری)).

## وورياكردنەوەی منداڵ لەو شتانەی کە حەرامە ئەنجام دانی

١- ئاگادارکردنەوەی منداڵ لە کوفر کردن و جوێن دان و لەعنەت کردن و قسەی ناخۆش، وە بۆیان ڕوون بکرێتەوە کە کوفرکردن حەرامە و بێ باوەڕی دەبێتە هۆی زەرەرمەندی و چوونە ناو ئاگری دۆزەخ، هەروەها پاراستنی زوبان لە بەردەمیاندا هەتا ببینە پێشەنگێکی باش بۆیان.

٢- وورياكردنەوەيان لە هاوەڵ پەیداکردن بۆ خوای گەورە بە هەموو جۆرەکانیەوە، لەوانە پاڕانەوە لە غەیری خوا، ئیتر ئەوەی کە لێی دەپاڕێیتەوە مردوو بێت یان زیندوو، بۆ جێبەجێکردنی کارێك، هەروەها سوێند خواردن بە غەیری خوا، (چونکە ئەو کەسانەش وەکو هەموو خەڵکی

هیـچیان دەسـەلاَت نیـە و نـاتوانن زەرەر بگەیـەنن یـاخود قزانج).

٣- ووریاکردنـەوەی منـداڵ لـەجۆرەکـانیقومـار وەك (یانصیب) و (طاوله) و چەندەها جۆری تر، جا ئەگەر بۆ کات بەسـەر بـردنیش بێـت، چـونکە ئـەو جـۆرە بـە نـاو باریانـە سەردەکێشێت بـۆ قومـار، هـەروەها دەبێتـە هـۆی دروسـت بوونی ڕق و کینە و لە دەست دانی پارە و پول و بەفیڕۆدانی کات و فەوتاندنی نوێژەکان.

٤- ڕێگـرتن لـە منـدالآن لـە خوێندنـەوەی ئـەو گۆڤـارە خراپانەی کە بابەتی خراپ و وێنەی ئافرەتی تێدایـە، یـاخود چیرۆکی پۆلیسی و جنسی تێدایە. هەروەها ڕێگرتن لێیان لـە چوون بـۆ سینەما و سـەیرکردنی ئـەو شـتانەی کـە زەرەری هەیە وە لە تەلەفزیۆنەکانەوە نیشان دەدرێت، چونکە ئەمانە هەمووی دەبێتە هۆی خراپ کردن و تێك دانـی خوڕەوشـتی مندالآن و داهاتوویان.

٥- وورياكردنەوەی مندالآن لە ترسناكی جگەرە كێشان و بۆيان ڕوون بكرێتەوەكە هەموو پزیشكەكانی دونیا ڕێكەوتوون لەسەر ئەوەی كە جگەرە كاریگەری خراپی هەیە لەسەر لاشە و بەهۆیەوە مرۆڤ تووشی‌نەخۆشی (سرطان) دەبێت و هەروەها دەبێتە هۆی زەرد بوونی ددانەكان و بۆنی ناودەم ناخۆش دەكات و سنگی مرۆڤ تووشی نەخۆشی دەكات و هیچ سودێكی‌نی‌یە، هەر بۆیە حەرامە جگەرەكێشان بەهەمان شێوە فرۆشتنی، وە پێویستە ئامۆژگاری مندالآن بكرێت بە خواردنی ئەو شتانەی كە سوودی هەیە بۆیان وەكو میوە.

٦-ڕاهێنانی مندالّ لەسەر ڕاست گۆی بە ووتە و كردار، وە وورياكردنەوەيان لەترسناكی درۆكردنوخراپی سەرئەنجامەكەی، ئەبێت درۆيان لەگەلّدا نەكەين تەنانەت بە گاڵتەشەوە، هەروەها كاتێك كە پەيمانێكمان پێ دان جێ بەجێی بكەين.

٧-دوورکەوتنەوەلەمالّی حەرام وبەکارنەهێنانی لە بەخێوکردنی ماڵ و منداڵدا وەکو بەرتیل و سو(ریبا) و دزی و غەش و خیانەت و ... هتد، چونکە مالّی حەرام هۆیەکی سەرەکییە کە منداڵ بە هۆیەوە یاخی دەبێت و کەسێکی بێ گوێ و خراپی لێ دەردەچێت.

## پێویستە منداڵەکانمان فێری نوێژ بکەین

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: ((مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع واضربوهم عليها وهم أبناء عشر و فرقوا بينهم في المضاجع))[١٠٥].

واتە: فەرمان بکەن بە منداڵەکانتان بەوەی کە هەستن بە فێر بوون و ئەنجام دانی پێنج فەرزەی نوێژ، کاتێك کە تەمەنیان گەیشتە حەوت سالّی، ئەگەر باش بەدەم فەرمانەکەوە نەهاتن وە سست بوون لە جێ بەجێ کردنی نوێژەکان، بەقسەی خۆش و نەرم و نیانی لە گەڵیاندا هەوڵ

[105] صحيح: اخرجه أبوداود (٤٩٤)، و ابن خزيمه (١٠٢\٢)، و الحاكم (٢٠١\١)، و غيرهم.

بدەن هەتا نوێژەکان لە کاتی خۆی دا بکەن، ئەگەر تەمەنیان گەیشتە دە ساڵی و هەروا مابوونەوە، ئنجا شێوازێکی تر بەکاربهێنن ئەویش لێدانە، بەڵام لێدانێك کە زەرەر نەدات لە لاشەی و کاریگەری خراپی نەبێت لەسەر جەستەی وە لە کاتی لێدانەکەدا سەر و دەم و چاوی بپارێزیت و لەو شوێنەی نەدەیت، هەروەها جێگای خەوی کوڕ و کچ جیابکەرەوە، با ئیتر کوڕان لە لایەك بخەون و کچان لە لایەکی تر.

## کەواتە بۆ فێرکردنی نوێژ دەبێت ئەم خاڵانەبگریتە بەر

١- دەست نوێژ گرتن و نوێژ کردن لەبەر چاویدا و بردنی بۆ مزگەوت و هاندانیان بۆ خوێندنەوەی ئەو نامیلکانەی کە باسی چۆنیەتی نوێژکردن دەکات.

٢- فێری قورئان خوێندنەوەی بکە و سەرەتا لە سورەتە کورتەکانەوە دەست پێ بکە، وەکو فاتیحە و سورەتەکانی کۆتای جوزئی (عمّ).

٣- هاندانی منداڵان بۆ ئامەدەبوون لە نوێژی جومعە و جەماعەتدا لە مزگەوتەکان وە فێربکرێن کە لە دوای

گەورەکانەوە سەف دروست بکەن بۆ نوێژ، هەروەها نەرم و نیانی لە کاتی ئامۆژگاری کردنیاندا ئەگەر هەڵەیان کرد، وە نابێت تورە ببین لێیان و بە دەنگی بەرز هاوار نەکەین بەسەریاندا، هەروەکو ئەمڕۆ دەبینین لە مزگەوتەکاندا، چونکە لەوانەیە بەهۆی ئەو تورەبونەوە جارێکی تر ئەو منداڵە نەوێرێت بێت بۆ مزگەوت تۆش بەو کارەت گوناهباری.

٤-هەروەها فێری حوکمەکانی نوێژ بکرێن وەکو: مەرجەکانی نوێژ و واجباتەکانی و ئەو شتانەی نوێژی پێ بەتاڵ دەبێتەوە و فێری چۆنیەتی نوێژەکان و زیکرەکانی ناو نوێژ و ...هتد.

٥-لەگەڵ ئەمانەشدا ڕابهێنرێت لەسەر بەڕۆژو بوون کە تەمەنی گەیشتە حەوت ساڵ بۆ ئەوەی کە پێگەیشت بەلایەوە ئاسان بێت.

## جل و بەرگی منداڵان وخۆدا پۆشینی کچان

هاندانی کچ بۆ خۆداپۆشین و شەرم و حەیا هەر لە منداڵیەوە بۆ ئەوەی کە گەورە بوو پەیوەست بێت پێوەی،

کەواتە نابێت جلی کورت و پانتۆڵ و کراس لەبەر بکات چونکە ئەوە خۆشوبهاندنە بە پیاوان و بە خەڵکانی بێ باوەڕەوە، هەروەها ڕابهێنرێن لەسەر داپۆشینی سەر ئەگەر بە پارچە قوماشێکی تەنکیش بێت کاتێ تەمەنی گەیشتە حەوت ساڵ، هەروەها ئامۆژگاری کردنی منداڵان بەوەی هەر ڕەگەزە و پەیوەست بێت بەجلی تایبەتی خۆیەوە بۆ ئەوەی جیابێت لە ڕگەزەکەی بەرامبەری، وە دووربن لە پۆشاکی خەڵکی بێگانە بە ئیسلام وەکو پانتۆڵی تەسك و چەندەها عادەتی خراپی بێ باوەڕان، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((لعن الله المتشبهين من الرجال بالنساء، و المتشبهات من النساء بالرجال ))، و ((لعن الله المخنثين من الرجال و المترجلات من النساء))[106].

واتە: لە عنەتی خوا (لەعنەت: واتە دووربوون لە ڕەحمەتی خوا) لەو پیاوانە بێت کە خۆیان دەشوبهێنن بە ژنان، وە لەعنەتی خوا لەو ژنانە بێت خۆیان دەشوبهێنن بە

---

[106] رواه البخاري.

پیاوانەوە، وە لەعنەتی خوا لە پیاوی ژنانی وە لەعنەتی خوا لەو ئافرەتانەی پۆشاکی پیاوان لەبەردەکەن و خۆیان وەکو پیاو نیشان دەدەن.

## پەروەکردن و فێرکردنی خورەوشتی جوان

١- ڕاهێنانی منداڵ لەسەر بەکارهێنانی دەستی ڕاست لە شت وەرگرتن و شت بەخشین و نان خواردن و ئاو خواردنەوە، وە بەدانیشتنەوە و ووتنی (بسم الله) لە سەرەتادا و ووتنی (الحمدلله) لە کۆتای دا.

٢-ڕاهێنانی منداڵ لەسەر پاك وخاوێنی و کردنی نینۆکەکانی و شتنی دەست لە پێش نان خواردن و دوای نان خواردن، هەروەها فێری خۆپاکردنەوە بکرێت و جل و بەرگی خۆی پیس نەکات.

٣-بەهێمنی و لەسەرخۆی ئامۆژگاری کردنیان بە شێوەیەکی بێ دەنگ و نەشکاندن و ناو زرنگاندنی لەبەر چاوی خەڵکیدا ئەگەر هەڵەی کرد.

٤- فەرمان کردن بە منداڵ لە کاتی بانگ داندا بە بێ دەنگی و وەلاّم دانەوەی بانگ بێژ.

٥-بۆ هەموو منداڵێك جێگەیەکی تایبەتی خۆی بۆ دابین بکرێت، ئەگەر دەسەلآت نەبوو ئەوا هەرکەسە و بەتانی خۆی جیابێت وە باشتر وایە کە ژوورێك بۆ کچان و ژوورێك بۆ کوڕان دابین بکرێت.

٦- فێربکرێت پیسی لەسەر ڕێگا و سەرجادەکان فڕێ نەدات و ئەگەر شتی بینی فڕێ درابوو لای ببات.

٧-وورياکردنەوەی لە هاوڕێی خراپ و چاوودێری کردنیان لەوەی کە نەوەستن لەسەر جادە و کۆڵانەکان.

٨-سلاّوکردن لە منداڵان لەناو ماڵ و لە ڕێگا و لە کاتی بینینیان بەشێوەی (السلام عليكم ورحمة الله).

٩-ئامۆژگاری کردنیان بەوەی کە چاك بن لەگەڵ دراوسێ و نارەحەتیان نەکەن.

١٠-ڕاهێنانی منداڵ لەسەر ڕێزگرتنی میوان و خزمەت کردنی بەو شێوەی کە شایستەیە.

## ئارام گرتن لەسەر مردنی منداڵ

پێویستە لە کاتی مردنی منداڵماندا ئارام بگرین و ڕازی ببین بە قەدەری خوای گەورە و ناشکوری و هاوار و دوعای شەڕ نەیەت بەسەر زوبانماندا، وە تێبگەین کە منداڵ ئەمانەت و موڵکی خوایە و کەی بیەوێت وەری دەگرێتەوە، هەربۆیە ئیمانداری تەواو ئەو کەسەیە کە لە یەکەم ساتەکانی مردنی منداڵەکەیدا ئارام دەگرێت و کارێك ناکات کە خوای گەورە پێ ی ڕازی نەبێت، ڕاستە مردنی منداڵ ناڕەحەتە و ناخۆشە بەڵام ئارام گرتن لەسەری خێر و پاداشتی زۆری هەیە:

١. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((لا يموت لأحد من المسلمين ثلاثة من الولد فتمسه النار إلا تحلة القسم))[١٠٧].

واتە: هەر موسوڵمانێك سێ منداڵی بمرێت ئەوا ئاگری دۆزەخ بەر جەستەی ناکەوێت ئەوەندەی ئەوە نەبێت کە خوای گەورە سوێندی لەسەر خواردووە. چونکە خوای

---

107 اخرجه الشيخان و البيهقي (٦٧\٤) عن أبي هريرة.

گەورە سوێند دەخوات و دەفەرمووێت: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾مريم: ٧١ .

واتە: هەموو کەسێك هەردەبێت بە جەهەننەمدا تێ بپەڕێت. یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی چۆن هەموو کەسێك دەبێت بەناو ئاگری دۆزەخدا تێ بپەڕێت؟ چۆن خوای گەورە سوێند لەسەر شتی وا دەخوات؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((مەبەستی خوای گەورە ئەوەیە هەموو کەس دەبێت بەسەر ئەو پردەدا بڕوات کە بەسەر جەهەننەمدا دروست کراوە و دەتگەیەنێتە بەهەشت، کە موسوڵمان بەسەر پردەکەدا تێ پەڕی و چووە ئەو بەرەوە ئەوا سوێندەکەی خوای گەورە دێتە جێ، بەڵام بێ باوەڕ دەکەوێتە خوارەوە بۆ ناو جەهەننەم)).

٢.هەروەها دەفەرمووێت: ((ما من مسلمين يموت لهما ثلاثة من الولد لم يبلغوا الحنث إلا أدخلهم الله و أبويهم الجنة بفضل رحمته، قال: و يكونون على باب من أبواب الجنة فيقال لهم:

ادخلوا الجنة فيقولون حتى يجئ أبوانا، فيقال لهم ادخلوا الجنة أنتم و أبواكم بفضل رحمة الله))[١٠٨].

واتــه: هــەر موســولْمانێك ســێ منــدالّی بمرێــت وە نەگەیشتبنە تەمەنی بالّغ بوون، ئیللا خوای گەورە دایك و باوكی ئەوسێ مندالّە دەخاتە بەهەشتەوە بە ڕەحم و بەزەی خۆی، بەو مندالاّنە دەوترێ: بڕۆنە ناو بەهەشتەوە، ئەوانیش لەبەردەم یەكێك لە دەرگاكانی بەهەشتدا وەستاون وە دەڵێن ناڕۆینە ناو بەهەشتەوە هەتا دایك و باوكمان نەیەن، ئنجا پێیان دەوترێت: بڕۆنە بەهەشتەوە خۆتان و دایك و باوكتان بە فەضل و ڕەحمەتی خوای گەورە.

٣.هەروەها دەفەرموێت: ((أيما امرأة مات لها ثلاثة من الولد كانوا حجابا من النار، قالت امرأة واثنان؟ قال: واثنان))[١٠٩].

---

108 اخرجه النسائي (١\٢٥٦)، و البيهقي (٤\٦٨)، و غيرهما بسند صحيح على شرط الشيخين.

واتە: هەر ئافرەتێك سیٚ منداڵی بمرێت دەبنە پەردە و بەربەستێك لە نێوان ئەو ئافرەتە و ئاگری دۆزەخ، ئافرەتێك لەوێدا بوو وتی: ئەی ئەگەر دوو منداڵی بمرێت؟ فەرمووی: ئەگەر دوو منداڵیشی بمرێت.

بەلاّم با چاك بزانین ئەم خێر و پاداشتە گەورەیە بۆ ئەو کەسانەیە کە ئارام دەگرن لەسەر مردنی منداڵیان و کارێك ناکەن کە خوای گەورە پیٚ ی ناخۆش بێت.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد و على اله و صحبه أجمعين
وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين.

---

[109] أخرجه البخاري (٣\٩٤)، و مسلم، و البيهقي (٤\٦٧) عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه.

# پێرستی بابەتەکان

بابەت — ژمارەی لاپەڕە